فنا في الله

# دەوڵەتی نوور

گوڵچنێک لە دەستەواژە و پێناسەکانی ناو کتێبی (مەوسوعەی کەسنەزانی)



هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد

**ئامادەکردن : هەژیر ئیسماعیل لالە ئەحمەد**

**ناوەند : ئەکادیمیای زانستی کوردی**

**ساڵی بڵاوکردنەوە : ٢٠٢٤**

HAZHIR ISMAEL

ئەکادیمیای زانستی کوردی
Kurdish Science Academy

# بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس بۆ خودای میهرەبان کە زەوی و ئاسمانەکانی پڕ کردووە لە زانست و زانیاری ، سوپاس بۆ ئەو خودایەی ڕێزی لە مرۆڤ ناوە بۆ ئەوەی بیربکاتەوە ، سوپاس بۆ ئەو خودایەی دڵ ی کرد بە دیاری بۆ مرۆڤەکان تا لە ڕێیەوە خودا بدۆزنەوە و بیناسن ، سەڵەوات و سەلامی خودا لەسەر پێغەمبەر موحەمەد ﷺ و هەم ئالوبەیت و یاوەران و شوێنکەوتوانی هەتا ڕۆژی دوایی ، لەم بەرهەمەدا سود لە کتێبی (موسوعة الكسنزان فيما اصطلح عليه أهل التصوف و العرفان) وەرگیراوە کە بەرهەمی (شێخ موحەمەد شێخ عەبدولکەریم شێخ عەبدولقادر شێخ عەبدولکەریم کەسنەزانی بەرزنجی قادری حوسەینی) یە ، هەوڵدراوە لەم کتێبەدا گوڵچنێک لە دەستەواژەکان بە زمانی شیرینی کوردی ئامادە بکرێت بۆ خوێنەرانی بەڕێز تاوەکو ئاشنا بین بە دەستەواژەکانی تەسەوف کە زانستێکی گرنگ و پێویستە لە هەموو سەردەمێکدا بۆ زاڵبوونی مرۆڤ بەسەر حەز و ئارەزووەکانی و گەیشتن بە سەرفرازی و ڕەزامەندی خودا .

"هەژیر"

# پێناسە و دەستەواژەکان

1. **ئادەم :** باوکی مرۆڤەکانە ، مرۆڤێکی کامڵە (ئیبن عەرەبی)

2. **ئـادەمی ڕووحەکـان :** بـریتیە لە ڕووحـی حەزرەتـی پێغەمـبەر ﷺ

(نەجمەدینی ڕازی)

3. **ئادەمی خێوەکان :** بریتیە لە حەزرەتی ئادەم (نەجمەددینی ڕازی)

4. **ئـادەمی ڕاسـتەقینە :** بـریتیە لەو نەفسـە گشـتیەی کە کـۆمەڵە نەفسـێکی

بەش بەشبووی تێدایە (ئیبن عەرەبی)

5. **ئـادەمی زەمـان :** یەک کەسـە لە یەک سـەردەم دا ، جێنشـینی

پێغەمـبەرە ﷺ کە لە سـەرەتای هەمـوو سـەدەیەک دێـت و خەڵـک

فێری بابەتەکانی ئاینەکەیان دەکات (ئیبن عەرەبی)

6. **ئادەمیی کات :** جێنشینی خودایە لەسەر زەوی (نەجمەدینی کوبرا)

7.**ئـادەمی مەشـرەب :** ئەو کەسـەیە کە دەگـاتە پـلەی ویلایەتـی لەتـیفە لە دڵـدا ، کە هەمـوو شـتێکی لەیـاد دەچێـت تەنهـا خـوا نەبێـت (ئەحـمەد فاروقی سەرهەندی)

8.**ئـــامین :** لەدوای نـــزا و پـــاڕانەوە دەوترێـــت بەمانـــای (وەڵاممـــان بـدەرەوە) دێـت (المعجم العربي الأساسي) ، ئـامین نـاوێکە لە ناوەکـانی خـودا (حەسـەنی بەصـرِی) ، ئـامین واتـا هیـوادارین کە وەڵامـی ئەو نزایانەمـان بـدەیتەوە کە پێـی داوامـان لێـت کـردووە (ئەبـو عەبـدولڕەحمانی سلمی) ، ئـامین واتـا ڕەزامەنـدین بەوەی بڕیـارت لێیـداوە لەسـەرمان و بۆمـان (ئەبـو عەبدولڕەحمانی سلمی)

9.**ئەبەدیەت (ناکۆتـابوون) :** واتـا بەردەوامبوونێـک کە کۆتـایی نەبێـت (المعجم العربي الأساسي)

10. **نهێنی ناکۆتابوون :** واتا نەفی کردن لە کۆتایی پێهاتن (ئیبن عەرەبی)

11. **ئەبەدی (ناکۆتا) :** ئەوەیە کە لەناو نەچێت (شەریفی جورجانی)

12. **ئیبــراهیم : بــاوکی پێغەمــبەرانە و بە خلیــل اللــه ناســراوە و بــاپیرە گەورەی پێغەمبەرە ﷺ** (المعجم العربي الأساسي)

13. **ئیبراهیمــــی مەشـــرەب : ئەو موریـــدەیە کە ســـیفەت و تواناکـــان هەمووی بداتە پاڵ خودای گەورە** (ئەحمەد فاروقی سەرهەندی)

14. **ئیبلــیس : گەورەی شــەیتانەکانە** (المعجــم العربــي الأساســي) **، نیشــاندەری بەزاندنە لەلایەن خوداوە** (ئیسماعیل حەقی بروسوی)

15. **بــاوکی یەکەمــی بــونەوەران : حەزرەتــی پێغەمــبەرە کە هــیچ گەردیــلەیەک نیــیە لە ســەرەتا تــا کۆتــایی ئەم دوونیــایە کە لەوەوە دروست نەبووبێت** (ئەبوعەباسی تیجانی)

16. **بــاوکی جەســتە مرۆڤییەکــان : حەزرەتــی ئــادەمە کە هەمــوو مرۆڤەکان لێیەوە پەیدابوون** (ئیبن عەرەبی)

17. **بــاوکی ڕۆحەکــان : بــریتیە لە بــاوکی یەکەم کە ڕوحــی حەزرەتــی پێغەمبەرە ﷺ** (ئیبن عەرەبی)

18. **باوکی میهرەبانی : بریتیە لە حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ (فەخرەدینی رازی)**

19. **باوکی ڕوحانی : بریتیە لە شێخ (موحەمەد مائولعەینەین)**

20. **ئەبولقاسم : نازناوێکی حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ (سەلام کوڕی عەبدوڵلای باهلی)**

21. **باوکی ئیمانداران : نازناوێکی حەزرەتی پێغەمبەرە ﷺ (جەلالەدینی سیوطی)**

22. **باوکی مەعنەوی : ئەو خۆشەویستیە خوداییەیە کە وادەکات کەسانێکی وەک بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی و صوهەیبی ڕۆمی لە ئالوبەیت هەژمار بکرێت (ئەبولهودا صەیادی ڕیفاعی)**

23. **پاشماوەی پیاوچاکان : ئەو نورە موحەمەدییەیە کە گواستراوەتەوە بۆ پیاوچاکان و بەو نوورە کاریگەری لەسەر دڵەکان و هەرشتێک کە دەستی لێبدەن دروست دەکەن ، ئەوەی گۆڕی پیاوچاکێک ماچ**

**دەکـــات لە ڕاســـتیدا مـــاچی ئەو نـــووره دەکـــات کە لەو شـــوێنە دەردەچێـــت ، هەروەک چـــۆن ئەوەی بەرگـــی قورئـــانی پیـــرۆز مـــاچ دەکـــات لەڕاســـتیدا مـــاچی ئەو نـــووره دەکـــات کە دەوری بەرگەکەی داوە** (موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)

24. **دروســـتکەری کـــاریگەری ڕاســـتەقینە : خـــودای گەورەیە** (عەبدولحەمیـــد تەبریزی)

25. **گوناهـــ : بـــریتیە لە تـــاوان و بێفەرمـــانی و ســـەرپێچی** (المعجـــم العربـــي الأساسي) ، **بریتیە لە کوفر و شەڕانگێزی و بێگوێیی** (جەعفەری صادق)

26. **گونـــاهی شـــاراوە : بـــریتیە لە کەمـــی دڵســـۆزی** (ئیـــبن عەتـــائی ئـــادەمی) ، **لەیادکردنی پێداچوونەوەیە بە گوناهەکانی پێشوو** (ئەبوبەکری شیبلی)

27. **گونـــاهی ئاشـــکرا : بـــریتیە لە هەڵەی جەســـتەکانی** (ئیـــبن عەتـــائی ئـــادەمی) ، **هەروەهـــا بـــریتیە لە غافـــڵ و بێئاگـــایی بـــوون** (ئەبـــوبەکری شـــیبلی) ، **بـــریتیە لە**

هەمـوو قسـە و کردارێـک کە بەپێـی حەزی خـود بێـت و پـێچەوانەی شەرع بێت (نەجمەددینی کوبرا)

28. **ئەحەد (تـاک) :** نـاوێکە بـۆ نەفـی کردنـی هەر ژمـارەیەکی تـر کە لەگەڵـی بـاس بکرێـت و نـاوێکە لە ناوەکـانی خـودا (ئیبن مەنزور) ، هەمـوو شتێک هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە (حوسەینی کوڕی مەنصوری حەلاج)

29. **تـاکە ئەحەدیەکـان :** بـریتین لە موریـدەکانی زاتـی حەق کە ڕاسـتگۆن لە داواکردنـی ئەو ، ژمارەیـان وەک گـۆگردی سـوور کەمە (عەبـدولقادری گەیلانـی) ، بـریتین لەو پیاوچاکـانەی کە خەڵـک دەبیـنن و خەڵـک نایانبینێـت ، بەهـۆی ئەوانەوە ڕووەک لە زەویـدا دەڕوێـت و ئاسـمان بـاران دەبارێنێـت و بەڵا لەسـەر بـونەوەران لادەچێـت ، خـواردن و خواردنەوەیـان زیکـری خـودایە وەک فریشـتەکان

(عەبدولقادری گەیلانی)

30. **وەرکرتنــی تەریــقەت :** بــریتیە لە بەدەســت هێنــانی تەریــقەت (المعجم العربــي الاساســي) ، بــریتیە لە پەیمانــدان لەســەر ڕەفتــارکردن بەپێــی پەیڕەو و پڕۆگرامی تەریقەتەکە (موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)

31. **ئــاخیر (دواهەم) :** نــاوێکی خــودای گەورەیە ، واتــا دەمێنێــتەوە دوای لەنــاوچوونی دروســتکراوەکانی (ئیــبن مەنــزور) ، بــریتیە لەو زاتەی کە شــوێنی نــیە و پێگەیشــتنی نــیە و لەنــاوچوونی بەســەردا نــایەت (شــێخ ئیبن موحەمەدی جفری)

32. **دواڕۆژ :** واتــا ژیــان لەدوای مــردن (ئیســماعیل حەقــی بروســوی) ، ئەوەیە کە شــارابووەوە لە جیهــانی شــاراوەدا کاتێــک بەنــدەکان دوای مــردن پێــی گەیشتن (ئەحمەد ڕیفاعی)

33. **ئەدەب :** ڕەفتــارکردنی دروســت و گونجــاوە (ئیــبن مەنــزور) ، وەرگێــڕی عەقــڵە (سـڕی سـقطی) ، بــریتیە لە کۆبــوونەوەی ســیفەتە چاکەکــان (قوشــەیری) ، ئەدەب دوو جــۆرە کە ئەوانــیش ئەدەبــی ســونەت و ئەدەبــی زانیــنە

(ئەبولحەسەنی شازلی) ، ئەدەب سێ جۆرە کە ئەوانیش ئەدەبە دەرحەق بە خودا و ئەدەبە دەرحەق بە پێغەمبەر ﷺ و ئەدەبە دەرحەق بە شێخەکانی تەریقەت (موحەمەد بەهائەدینی نەقشبەندی)

34. **ئەدەبی حەق :** ئەوەیە کە بزانیت چی بۆ تۆیە و چی بۆ ئەو(خودا)–ە (ئیبن عەرەبی)

35. **ئەدەبی سونەت :** بریتیە لە وەرگرتنی زانست لەپێناو خودا (ئەبولحەسەنی شازلی)

36. **ئەدەبی شەریعەت :** بریتیە لە گوێڕایەڵی کردن بۆ فەرمانەکان و خۆ بەدوورگرتن لە قەدەغەکراوەکان (ئیبراهیمی کوڕی موستەفای موسڵی)

37. **ئەدەبی تەریقەت :** بریتیە لە خۆ تەسلیم کردنی گشتی بە شێخی تەریقەت بەوەی دادەنرێت بە باوکی ڕووحی بۆ موریدەکان (موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)

38. **ئەدەب لەگەڵ خودا :** وتنی ڕاستی و حەقە (ئەحمەد ڕیفاعی)

39. **ئەدەب نواندن : واتا خۆگرتنەوە لە کاردانەوە بەرامبەر بە توندی خەڵک ، و هەوڵدان بۆ بەرگەگرتنی زیان پێگەیاندنیەکانیان پێت ، بۆ ئەوەی بەمە نەفست بمرێنیت و حەز و ئارەزووەکانت دابمرکێنیت**

**(ئەبو حامیدی غەزالی)**

40. **ئیدریس : پێغەمبەرێکە** **(المعجم العربي الأساسي)** **، قوتبی (جەمسەری) هەرەگەورەیە لە ئاسمانی چوارەم** **(عەبدولکەریمی جیلی)**

41. **کەرەستەکانی حەقیقەت : بریتیە لە کەرەستە ڕووحیەکان کە یارمەتی مورید دەدەن بە گەیشتن بە پلە و پایە ڕوحیەکان کە دەگاتە پلەی بەستنەوە بە ڕووحی پێغەمبەر ﷺ ، لەوانەش ئەو زیکر و ویردەی کە ڕێگەی پێدراوە لەلایەن شێخی تەریقەتەوە و پەیوەندیەکی دڵی و ڕووحیە لەگەڵ شێخەکەدا** **(موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)**

42. **کەرەستەکانی تەریقەت :** ئەو کەرەستانەن کە یارمەتی موریدەکان دەدەن لە جێبەجێکردنی یادەکانی تەریقەت و یادکردنەوەی خودا ، کە ئەوانەش کۆمەڵە شتێکی پیرۆزن کە پێویستە پارێزگاریان لێ بکرێت لەوانەش : بەیداغ ، گوچان ، تەسبیح ، بەرماڵ ، دەف ، تەپڵ (موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)

43. **ڕێکەپێدان :** نورێکە کە خودای گەورە دروستی دەکات لەناو دڵدا (ئەبولحەسەنی شازلی) ، بریتیە لە قەزا و قەدەری خودای گەورە کە هیچ شتێک بە بێ ویستی ئەو ڕوونادات (عەبدوڵای کوڕی عەباس) ، ئەوەی ڕێگەی پێ بدرێت بۆ ڕوونکردنەوە ئەوا بونەوەران بە گوێیان لە دەربڕینەکەی تێدەگەن (ئیبن عەتائوڵای سکندری)

44. **زەوی :** یەکێکە لە هەسارەکانی کۆمەڵەی خۆر و ئەو هەسارەیەیە کە ئێمە تێیدا دەژین (المعجم العربي الأساسي) ، بریتیە لە زەوی نەفسەکان (ئەبولعەباسی مرسی) ، بریتیە لە دڵی ئەولیاکان (جەعفەری صادق)

45. **زەوی خــودا : بــریتیە لە دڵ** (نەجمەدینــی کــوبرا) ، **بــریتیە لەو نەفســە بـیخەمەی کە خـودای گەورە قبـوڵی دەکـات و نەفسـەکە بە خـوداوەیە کەوا بێخەمە** (ئیبن عەرەبی)

46. **زەوی حەقـــــیقەت : بــــریتیە لە دڵ دوای ئەوەی کە پەردەپۆشـــــی تاوانی لەسەر لادەچێت** (موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)

47. **زەوی تەریقەت : بریتیە لە شەریعەت** (موحەمەد ئەلموحەمەد کەسنەزانی)

48. **زەوی پەرســتش : ئەو زەویەیە کە دەبێــتە میراتــی پیاوچاکــان** (ئیــبن عەرەبی)

49. **زەوی زانین : بریتیە لە دڵی ئەولیاکانی خودا** (حەکیمی ترمزی)

50. **زەوی پیــرۆز : بــریتیە لە دڵ کە لە چــاو ئاســمانی ڕووحــدا زەویە** (ئیبن عەرەبی)

51. **ئەزەل : بـریتیە لەوەی کە ســەرەتا و کۆتــایی نیــیە** (قوشـەیری) ، **بــریتیە لەوەی کە ســـەرەتایەکی نەبێـــت** (ئیــبن عەرەبــی) ، **ئەوەیە کە زاتــی حەق**

تێیدا بوونی هەیە و جگە لەو شتی تر بوونی نیە (ئەبولعەباسی تجانی) ، ئەوەی سەیری ئەزەلی و ئەبەدی بکات و لەوەی دەکەوێتە نێوانیان چاوپۆشی بکات ، ئەوا تەوحید و یەکتا پەرستی چەسپاندووە ، ئەوەشی چاوپۆشی لە ئەزەلیەت و ئەبەدیەت بکات و سێری نێوانیان بکات ئەوا پەرستشی بەدی کردووە (حوسەینی کوڕی مەنصوری حەلاج)

52. **ئوستاد :** واتا مامۆستا (المعجم العربي الأساسي) ، لە شێخ کامڵ ترە لە حاڵ و ئەحواڵدا (موحەمەد ئەبولمەواهیب شازلی) ، ئەو دەرگایەیە کە مورید لێیەوە دەچێت بۆلای پێغەمبەر (موحەمەد سمنهودی ) ، ڕێگایەکە بۆ بەدەستهێنانی ڕاستیەتی کەماڵی ئیمان (موحەمەد ئەسعەد خالدی) ، پێویستە مورید شێخێکی هەبێت کە پەروەردەی بکات ، ئەوەی مامۆستایەکی نەبێت سەرفراز نابێت (قوشەیری)

53. **ئیسرافیل :** ئەو فریشتەیەیە کە فوو لە کەڕەنا (صور) دەکات (مجمع الزوائد)

54. **بنچینه :** بریتیه له زانست (سەهلی تستری) ، ئەو شتەیە کە زیادبوونی بەدوادا دێت (سیراجی طوسی) ، ئەوەیە کە لقەکانی بۆ دەگەڕێنەوە و لێیەوە زیاد دەبن (قوشەیری) ، بریتیە لە پێغەمبەر (سەڵوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە بناغەی هەبوونە و ئەو ڕەحمەتی خودایە کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە و بنچینەی بنچینەکانە و بنچینەی هەرەمەزنە کە لە ڕووناکی ئەو شتەکان لە تاریکی نەبوونەوە هاتنە بوون (کەسنەزانی)

55. **بنچینەی کۆکەرەوە :** بۆ هەموو بونەوەرن بریتیە لە بونیادی موحەمەدی (سەڵوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) (ئیبن عەرەبی)

56. **ئێکسیر :** مادەیەکە کۆن پێیان وابوو کە کانزاکان دەگۆڕێت بۆ ئاڵتون (زمانەوانی) ، بریتیە لە دۆستە گەورەکەی خودا ، هەرکەس پێی بگات سەرفرازە و ڕزگاری دەبێت لە ماندووبوون و نەهامەتی (ئەبولمەواهیبی شازلی)

57. **ئـــازار :** قەڵایەکـــی حەزرەتـــی حەقە کە بەنـــدەکان لە بەڵا دەپارێزێـت (ئەبـو سـەعیدی کـوڕی ئەبـی ئەلخەیـر) ، بـریتیە لە چێـژ وەرنەگـرتن و بەدەستنەهێنانی مەبەست (ئیبن عەرەبی)

58. **خوداوەنـد :** ئەو زاتەیە کە هەمـوو ناوەکـان بـۆ ئەوە ، هەمووشـی مەبەست لێی یەکێکە کە پێی دەوترێت الله (ئیبن عەرەبی)

59. **خودای مەجازی :** مەبەست پێی نەفسە (عەلی کیزوانی)

60. **خـودای بیروباوەڕەکـان :** بـریتیە لە دەرکەوتنـی خــودا لە شـێوە و وێنـایی بیروبـاوەڕی بەنـدە ، خـودایەکی سـنوردارە کە لە دڵـی بەندەکەیدا جێگای بووەتەوە (ئیبن عەرەبی)

61. **الله :** بریتیە لە ناوێکی تاک و تەنها و زیاد ناکرێت بۆ هیچ شتێک بەڵکـو هەمـوو شـتێک دەدرێـتە پـاڵ ئەو (جەعـفەری صـادق) ، ئەو نـاوەیە کە بڵنـدە بەسـەر هەمـوو ناوەکـانی تـردا (حەکیمـی ترمـذی) ، بـریتیە لە نـاوی هەرە مەزن کە هەمـوو ناوەکـانی لەخـۆ گرتـووە (سـەهلی کـوڕی عەبـدوڵای)

(تستری) ، بـریتیه له دەرخستنی شکۆمەندی و گەورەیـی خـودا (ئیبن عەتـای ئـادەمی) ، بــریتیه له نــاوی زاتـــی خـــودا که ســیفەتی جـــوانی و شـــکۆمەندی لەخۆگرتـــووه (نەجمەدینـــی کـــوبرا) ، بـــریتیه له کـــۆکراوەی ڕاستیەتی هەمـوو نـاوه خوداییەکـان (ئیبن عەرەبی) ، بـریتیه له ناوێـک که ڕوونـاکیه بـۆ هەمـوو تاریکیەکـان ، تێیـدا بەنـدەکان حەق دەبیـنن و بـــونەوەران دەبەســـترێنەوه به ناســـینی حەق (عەبـــدولکەریمی جیلـــی) ، ئەو نـاوەیه که ئەگەر لەســەر زەوی نەمێنێــت قیـامەت هەڵدەســتێت (ئەحــمەد زرووق) ، بــریتیه له نــاوی زاتــی خــودا که هەمــوو ســیفەتەکانی لەخــۆ گرتــووه (مـوحەمەد مـورادی نەقشـبەندی) ، بـریتیه له نـاوی هەره مەزنـی خـودا (مـوحەمەد بەهـائەدینی بەیطـار) ، بـریتیه له نـاوی خـودا که کـۆکراوەی هەمـوو سیفەته کامڵەکانه (سەعیدی نورسی)

62. **لا إلـه إلا اللـه :** واتـا هـیچ پێناسـێک جـگه له پێناسـی ئەو بـوونی نیـه (نەجمەدینی کوبرا)

63. **ئیلیـــاس :** یەکـــێکە لە پێغەمـــبەران و لە قورئـــانی پیـــرۆزدا نـــاوی هـــاتووە (زمـــانەوانی) ، بـــریتیە لە لێســـەندنەوە لەوانەشـــە ئەوە بێـــت کە لەســـەر دەســـتی حەزرەتـــی خـــدر دەیـــدات (ئیـبن عەرەبـی) ، بـــریتیە لەو کەســەی کە بە تێکەڵبــوونی لەگەڵ فریشــتەکان ئاســوودەبوو بە لایەنـــی ڕووحـــی و بە تێکەڵبـــوونی لەگەڵ مرۆڤەکـــان ئاســـودەبوو بە لایەنـــی بونیـــادی مرۆیـــــی (بـــالی ئەفەنـــدی) ، بـــــریتیە لە ئیـــــدریس و لەبەر بەرزبـــوونەوەی بەســـەر جیهـــانی ڕوحیـــدا هەمـــوو هێـــزە مەزاجیەکـــانی نەمان (شەریفی جورجانی)

64. **فەرمـــــانی خــــودایی :** بـــــریتیە لە دروســــتکردن و بەدیهێنــــــان و بەرهەمهێنــــان (فەخرەدینـــی ڕازی) ، بـــریتیە لە زاڵبـــوونی بەســـەر هەمـــوو جیهانەکاندا (عەبدولغەنی نابلسی)

65. **وەلـی ئەمـر – لێپرسـراو (سەرپەرشـتیار) :** بـریتیە لە زاناکـان (جونەیـدی بەغدادی)

66. **پێشـــەوای هەرە مەزن :** بــریتیە لە حەزرەتـــی پێغەمـــبەر (ســـەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) (ئیبن عەرەبی)

67. **پێشــەوای صــۆفیەکان :** بــریتیە لە حەزرەتــی ئیمــامی عەلــی کــوڕی ئەبــو تاڵیــب (ســەڵەوات و ســەلامی خــودای لەســەربێت) کە گەورەی ئەوان و ڕابەریانە (شێخ عەرەبی دەرقاوی)

68. **پێشەوای دادپەروەر :** بریتیە لە دڵ (ئیبن عەتائوڵڵای سکندری)

69. **پێشــەوای ســەردەم :** کەســێکە لە هەمــوو ســەردەمێکدا کە ســیفەت و ئاکــارە مــوحەمەدیە ڕاســتیەکان تــێکەڵ بە خــوێن و هەناســەی بــووە ، یەکەم کەس کە لەم پــێگەیە بـــووە باوکمـــان حەزرەتـــی ئـــادەمە (سەلامی خوای لەسەربێت) (عەبدولکەریمی جیلی)

70. **دایــک :** بــریتیە لە کــۆکراوەی چــوار ڕەگەزەکەی کە هێــزی مرۆیــی لــێ پەیــدادەبێت بەوەی کە خــۆڵ و ئــاو مــایەی دڵخۆشــی لەبەر ئەوەی ژیــانبەخش و بەبەرهەمــن بەڵام ئــاگر و هەوا بە پــێچەوانەوە ســوتێنەر

و مـــرێنەرن (غەوس عەبـــدولقادر گەیلانـــی) ، بـــریتیە لە ئـــادەم چـــونکە حەوا لەوەوە دروست بووە بەمەش ئادەم دایکە بۆ حەوا (ئیبن عەرەبی)

71. **باوەڕ** : درەوشـانەوەیەکی سـپییە لە دڵـدا کە هەتـا بـاوەڕ زیـاد بکـات دڵ سـپی تـر دەبێـت و کە بـاوەڕ کامـڵ ببێـت دڵ سـپی دەبێـتەوە (حەزرەتـی عەلـی کـوڕی ئەبوتاڵیـب) ، بـریتیە لەوەی بە گوێکانمـان بیسـتوومانە و بە دڵەکانمـان بە ڕاسـتمان دانـاوە (ئیمـامی حەسـەنی کـوڕی حەزرەتـی عەلـی) ، بـریتیە لە دانپێـدانان و کـارکردن و نـیەت (ئیمـام مـوحەمەدی بـاقر) ، بـریتیە لە نـاوەڕۆکی ئیسـلام و بـریتیە لە کردارەکـانی دڵ (ئەبوتـاڵبی مەککـی) ، بـریتیە لە وتـن بە زمـان و بـاوەڕبوون بە دڵ (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، بـریتیە لە چەسـپاندنی ئەوەی پێمـان گەیشـتووە لە ئـاین بە دڵ (ئەحـمەدی سـەرهەندی) ، بـریتیە لە چەسـپاندن و دانپێـدانان بەبـێ چـۆنیەتی و چەنـدێتی و شـێوەدانان (ئەحـمەد کمشـخاتوی نەقشـبەندی) ، بـریتیە لە

ڕووناکیەک کە خودا هەڵی دەداتە دڵەکانەوە (عوبەیدە کوڕی ئەنبوجەی تیشیتی) ، بریتیە لە یەکەمی پێگە و پایەکانی شەریعەت (فازڵی بەرکەوی)

72. **دەفری باوەڕ :** بریتیە لە دڵ (ئەبولحوسەینی نوری)

73. **باوەڕدار :** ڕاستگۆیە لەگەڵ ئەو کەسەی گوێڕایەڵی دەکات (ئیبن عەتای ئادەمی) ، بریتیە لەو کەسەی ترسی ئەوەی لەسەر نیە ستەم بکات (ئەبو عەبدولڕەحمانی سەلمی) ، بریتیە لە ناوەکانی خودا و ماناکەی واتا بەندەکانی باوەڕ بە بەڵێنەکانی دەهێنن (جەلالەدینی سیوطی) ، واتا هەرکەس پەنای بۆ ببات پارێزراو دەبێت لە هەموو بەڵا و خراپەیەک (عەبدولڕەحمانی صەفوری) ، بریتیە لەو کەسەی کە قسە و کرداری وەکو یەکە و نهێنی و ڕووکەشی وەکو یەکە (حەسەنی بەسری) ، واتا ئەو کەسەی کە لە ماڵی نەفس و حەز و خووەکانی دێتە دەرەوە و ڕوودەکاتە خودا (غەوس عەبدولقادری گەیلانی) ، ئەو کەسەیە کە خەڵک لێی پارێزراوە و خوداش دڵی زیندوو کردۆتەوە (نەجمەدینی

کوبرا) ، ئەو کەسەیە کە دەڵێت اللە و هیچی تری لەگەڵ نییە (ئیبن سەبعین) ، واتا ئەو بەندەیەی کە کەموکوڕیەکانی خۆی دەبینێت و باسی کەموکوڕی کەس ناکات (ئیبن عەتائوڵلای سکندری) ، واتا ئەوەی باوەڕی هێناوە بە خودا و پێغەمبەرەکەی (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) و ئەو کتێبەی لەگەڵی دابەزیوە (شەریفی جورجانی)

74. **خۆپەرستی :** ئەوەیە بڵێیت من (ئیبن عەرەبی)

75. **ئینجیل :** بریتیە لە دەرکەوتنی زاتی خودا لە ناوەکانیدا (عەبدولکەریمی جیلی) ، وەک پێگەی چاوە لە مرۆڤدا ، چونکە پوختەی تەوراتە لەبەر ئەوەی بڕیار و نهێنی لەخۆ گرتووە و کرۆکی ئەوەیە کە لە تەوراتدا هەیە (عەبدولغەنی نابلسی)

76. **مرۆڤ :** وێنەی خودایە نە ئاوە و نە خۆڵە بەڵکو نهێنیەکی پیرۆزە (فەریدەدینی عەتتار) ، واتا جیهانی گەورەی ڕوحەکان (نەجمەدینی ڕازی) ، واتا کتێبێکی کۆکراوەی هەموو کتێبە خوداییە و گەردوونیەکان

(ئیبن عەرەبی) ، واتا کۆکراوەی عەقڵ و نەفس و ڕوح کە هەموو جیهانی تێدا کۆبۆتەوە (عەلی خەواص) ، بریتیە لە کۆکراوەی جەستە و ڕوح (ئیبن عەجیبە) ، واتا پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە هەموو جیهان لە ڕۆشنایی ئەو دروست بووە

(موحەمەدی مەککی)

77. **پیاوانی خودا :** کەسانێکن کە پشتیان بەو بەستووە و پشتیان کردووەتە جگە لەو (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، کەسانێکن کە خودا لە ڕێنوێنی کردوون و خودایان خۆش دەوێت و تەنها ئەو دەناسن و جگە لەو کەسیان خۆش ناوێت (ئەبولحەسەنی شازلی) ، ئەو کەسانەن کە ڕووناکی باوەڕ و ڕووناکی زانستیان هەیە (ئیبن عەرەبی)

78. **ئاه :** بریتیە لە ئازار یاخود سکاڵاکردن (زمانەوانی) ، بریتیە لە ناوی خودا (نەجمەدینی کوبرا)

79. **دەریای هەرە مەزن :** بریتیە لە پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) کە هەموو جۆگە و دەریاکان لەوەوە هەڵقوڵاون و بەدەرکەوتوون (موحەمەد بەهائەدینی بەیتاڕ)

80. **دەریای تەریقەت :** بریتیە لە شێخی تەریقەت چونکە سەرچاوەی هەڵقوڵان و دەرچوونی پشتیوانیەوە لێیەوە ، واتا ئەو هێزە ڕوحیەیە کە لە حەقیقەتی موحەمەدی سەرچاوەی گرتووە (کەسنەزانی)

81. **دەریای تەریقەتەکان :** حەزرەتی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب (سەڵات و سەلامی خوای لەسەربێت) کە هەموو تەریقەتە سۆفیگەریە ڕاستەکان بۆ ئەو دەگەڕێنەوە و لەدوای پێغەمبەر مامۆستای یەکەمە کە هەموو لقەکانی سۆفیگەری لێوەی جودا بووە

(کەسنەزانی)

82. **دەریـای دڵ :** بـریتیە لەو زانسـت و نهێنـی و دانـاییە خوداییـانەی کە هـیچ کەسـێک ناتوانێـت سـنورێکی دیاریکراویـان بـۆ دابنێـت (غەوس عەبدولقادری گەیلانی)

83. **دەریـــای یـــاقوتی ســـور :** ئەو کەســـەیە کە ناســـراوە بەوەی هـــیچ هاوشێوە و هاووێنەیەکی نیە (ئیبن عەرەبی)

84. **کەنجیـــنەی چاکەکـــاری :** بـــریتیە لە شـــاردنەوەی نهێنـــی و بەڵا و نەخۆشی و سەدەقە و خێر و چاکە (غەوس عەبدولقادری گەیلانی)

85. **بەرەکەت – فەڕ :** ئەو کـــاریگەریە ڕووحیـــیەیە کە تەنهـــا لەلایەن شـێخێکی پەروەردەکـارەوە بـۆت دێـت (ئەبـو حامیـدی غەزالـی) ، بـریتیە لە زیـــادبوون کە لە دەرئەنجـــامی سوپاســـگوزاری دێـــت (ئیـــبن عەرەبـــی) ، بـریتیە لا مـانەوەی خێـر و چـاکەی خـودایی لە شـتێکدا (ئیسـماعیل حەقـی بروسـوی) ، بـریتیە لە نـووری حەزرەتـی پێغەمـبەر (سـەڵەوات لەسـەر خۆی و بنەماڵەکەی) لەناو شتە هەبووەکاندا (کەسنەزانی)

86. **مانگـا :** **ئـاژەڵێکی جەسـتە گەورەیە کە شـیر و گۆشـتەکەی دەخورێـت** (زەمـانەوانی) ، **بـریتیە لە نەفس و خـود ئەوەش چـونکە کە بەنـی ئیسـرائیل کەسـێکیان کوشـت فەرمانیـان پێکـرا مانگـایەک سـەرببڕن ، بـۆیە مانگـا نەفـــس و خـــودی ئــــاژەڵیە ، ســـەربڕینی حەز و ئارەزووەکـــانی ئەم نەفسـەش بـریتیە لە بەخشـینەوەی ژیـان پێـی ئەوەش لەڕێـگەی ڕێگـری کـردن لێـی بە دەمـی تیـژی تیغـی ڕیـازەت کێشـان و خـۆگرتنەوە لە خواردن و تاوان** (ئیبن عەرەبی)

87. **مــانەوە – بەقــا :** **بــریتیە لە بینینـــی دەســەڵات و توانــای خــودا لە شـــتەکان** (ئەبـو یەعقـوبی نەهرجـوری) ، **بــریتیە لە ئامــادەبوون لەگەڵ زاتـــی حەقدا** (ئەبو سەعیدی خەراز) ، **بریتیە لە مانەوەی پەرستشەکان** (قوشەیری)

88. **گریـــان :** **بــریتیە لە ئــارەقکردنەوەی دڵ لە شـــەرمەزاری تاوانـــدا** (قوشەیری)

89. **بەڵای هەرە مەزن :** بـــريتيە لە لەدەســـتدانی يـــار و خۆشويســـتراو

(غەوس عەبدولقادری گەيلانی)

90. **دەرکاکـانی دۆزەخ :** بـريتين لە پێـنج هەسـتەکە و حەز و ئـارەزوو و

تورەيی (ئيبن عەرەبی)

91. **دەرکای هەمووان :** بريتيە لە خودا (ئيبن سەبعين)

92. **مـاڵی خـودا :** بـريتيە لە دڵـی بەنـدەکان کە شـوێنی تێڕوانينـی

خـودايە و سـەرچاوەی زانسـتيەتی و نشـينگای نهێنيەکـانی و شـوێنی

دابەزينـی فريشـتەکانيەتی تێيـدا و گەنجيـنەی نهێنـی و کەعـبەی

مەبەستە (ئيبن عەرەبی)

93. **تـابوت – دارەبـاز :** بـريتيە لە جەسـتەی مـرۆڤ ، کە صـۆفيەکان پێـی

دەڵێـت (ناسـوت) و لە بەرامبەريـدا (لاهـوت) هەيە کە ئامـاژەيە بـۆ

ڕووح (ئيبن عەرەبی)

94. **خـۆڵ :** هەر شـتێکە کە سـاردی و وشـکێتی زاڵ بێـت بەسـەریدا و هەردوو لایەنەکەی تـری (گەرمـی و شـێ) ی تێـدا نەمێنێـت بەهـۆی لاوازیان لەم پلەیەدا (عەبدولکەریمی جیلی)

95. **تەکـیە :** بـریتیە لە مـاڵی زیکـر و یەکـێکە لە گرنگتـرین بنەماکـانی تەریـقەت و ڕێبـاز ، ئەوەش چـونکە سـود و بەرهەمێکـی زۆری ڕوکەشـی و ڕووحـی هەیە کە موریـد و ڕێبـواری ئەو ڕێگـایە سـودمەند دەبێت لێی ، شوێنی خوداپەرستی و خودا ناسینە (کەسنەزانی)

96. **خانەقا :** بـریتیە لە خـان یـاخود مـاڵ و وشـەیەکی فارسـیە ، بە واتـای ماڵی دەروێش و سۆفی و هەژاران دێت (کەسنەزانی)

97. **خوێنـدکاری ئیبلـیس :** هەرکەسـێکە کە خـۆی پـێ باشـتر بێـت لەوی تر ، چونکە بەخۆی سەرسام بووە (موحەمەد نەبهانی)

98. **تـیلاوەت – خوێنـدنەوەی قورئـان :** بە زمـان بـریتیە لە خوێنـدنەوەی ئایەتەکان و بە دڵ واتا بینی ئایەتەکان (کەسنەزانی)

99. **تەوبە :** بـــریتیە لە پشـــتیوانی و هاوکـــاری خـــودا ، پێویســـتە بەنـــدە هەمیشـە بگەڕێـتەوە بـۆلای خـودا (جەعـفەری صـادق) ، بـریتیە لە یـادکردنی تـــاوان (جونەیـــدی بەغـــدادی) ، بـــریتیە لە دانپێـــدانان و پەشـــیمانی و وازهێنـان (ئەبـو عەلـی ڕۆزبـاری) ، بـریتیە لەو ئـاوەی زاتـی خـودا کە زەوی زینـدوو دەکـاتەوە دوای مردنـی بە بـاران و دڵەکـان زینـدوو دەکـاتەوە دوای مردنیـان (غەوس عەبـدولقادر گەیلانـی) ، بـریتیە لە نەگەڕانەوە بـۆ تـاوان هەروەک چـۆن شـیر نـاگەڕێتەوە نـاو گوانەکـان (ئەحـمەد ڕیفـاعی) ، بـریتیە لەوەی ڕەشـایەتی دڵ دەسـڕێتەوە و بۆنخۆشـی دەکـات بە بـۆنی قبـوڵ کردن (ئیبن عەتائوڵڵای سکندری)

100. **تەوبەی گشتی :** بریتیە لە گەڕانەوە لە تاوان (قوشەیری)

101. **تەوبەی تـــایبەتی :** بـــریتیە لە گەڕانەوە لە بێئاگـــایی بـــوون لەخودا (ذوالنونی میسرِی)

102. **تەوبەی تـــایبەتی تایبەتەکـــان :** بـــریتیە لە تەوبەکـــردن لە هەر شتێک کە جگە لە خودا بێت (ئەحمەد بن علویە مستغانمی)

103. **تەوبەی دڵ :** بـــریتیە لە نیەتـــی وازهێنـــان لە تـــاوان (ذوالنـــونی میسرِی)

104. **تەوبەی دەســت :** بـریتیە لە وازهێنـان لە خـواردنی هەرشـتێک کە هی ئەوکەسە نەبێت (ذوالنونی میسرِی)

105. **تەورات :** بریتیە لە ئاماژەیەک بۆ ڕۆشنایی و نور (ئیبن عەرەبی)

106. **هەنجیــر :** ئامــاژەیەکە بــۆ زانســتە ڕاســتەقینەکان ، تەمەنــی درەختــی هەنجیــر کــورتتر و کەمتــرە لە درەختــی زەیتــون ، بــۆیە ئەهلــی حەقــیقەت بەو شــێوەیە تەمەنیــان کەمە چــونکە مانــای نیــیە مــانەوە لە دونیــایەکی فــانی و لەنــاوچوو دوای گەیشــتن بەو مەبەســتەی کە هەبووە (ئیسماعیل حەقی بروسوی)

107. **ثەمود : بریتیە لە ئاماژەیەک بۆ هێزی حەز و ئارەزووەکان**

(ئیسماعیل حەقی بروسوی)

108. **سیخوڕەکانی دڵ : کۆمەڵە هەژارێکن ، ئاگاداربە کە بە ڕەوشتێکی جوانەوە لەخزمەتیان دابنیشیت ، چونکە لەوانەیە بچنە ناو دڵت و دەربچن و بزانن چی تێدایە بەبێ ئەوەی پێی بزانیت**

(سەهلی تستری)

109. **جەستە : بریتیە لە دەریای حەز و ئارەزووەکان** (یەحیای ڕازی)

110. **تەجەلا : بریتیە لە پەروەردەکردنی کەسە تایبەتەکان** (جونەیدی بەغدادی) **، بریتیە لە دەرکەوتنی ڕووناکیەکانی خودا بەسەر دڵی موریدەکاندا** (قوشەیری)

111. **جەلوە : بریتیە لە دەرچوون لە خەڵوەت و گۆشەگیری** (ئیبن عەرەبی)

112. **جوانی : بریتیە لە تەجەلای دڵ بە ڕۆشنایی و دڵخۆشی و وتەی شیرین و بەسود و مژدەبەخشین و پێگە بەرزی و نزیکبوونەوە لە خودا** (غەوس عەبدولقادری گەیلانی)

113. **دووباڵ – ذوالجناحین : بریتیە لە نازناوی پێشەوامان جونەیدی بەغدادی چونکە مۆڵەتی زانستی وەرگرتووە و مۆڵەتی ڕووحی** (کەسنەزانی)

114. **سەرباز : بریتیە لە موریدە کە بەرەنگاری حەز و ئارەزووەکانی ناخی خۆی دەبێتەوە** (کەسنەزانی)

115. **بەهەشت : بریتیە لە میراتی کردەوەکان** (ئیبن عەتای ئادەمی) ، **ئامادەبوونە لەخزمەت خودا** (ئەبو مەدینی مەغریبی) ، **بریتیە لەوەی باوەڕدارە گشتیەکانی مژدە پێ دراوە کە هەموو شتێکی تێدایە کە خودەکان ئارەزووی بکەن ، بەڵام بەهەشتی باوەڕدارە تایبەتەکان ئەو شتانەی تیایە کە ڕوحەکان ئارەزووی دەکەن کە ئەوەش دیدار**

و بینینــی زاتــی خــودایە و چێــژ وەرگــرتنە لێــی (عەبـدولقادری جەزائیـری) ، بەهەشــت بــریتیە لە بینــین و لەبەرامــبەردا دۆزەخ بــریتیە لە چاوپۆشــین و پەردەپۆشین بەسەر بینیندا (ئیبن عەرەبی)

116. **شـــێت :** بــریتیە لە ڕێبـــواری ڕێگـــا ، لەبەر ئەوەی بـــووە بە کەســێکی کەڕ و کــوێر و لاڵ لەپێنـــاو دۆســـت و خۆشەویســـتەکەیدا و جگە لەو هیچ نابینێت (موحەمەدی نەبهانی)

117. **تێکۆشـــان – جیهـــاد :** بـــریتیە لە دابڕینـــی بەنـــدە لە حەز و ئارەزووەکـــانی و پەیوەســـتبوونی بە خـــودا (جەعـــفەری صـــادق) ، بـــریتیە لە دابڕینــی خــود لە حەز و ئارەزووەکــان و دابڕینــی دڵ لە گومانەکــان (ئەبـو عوســمانی نیســابوری) ، بــریتیە لە پەروەردەکردنــی خــود بە برســێتی و کەمخــۆری و گــوێڕایەڵی نەکردنــی حەز و ئارەزووەکــان لە هەمــوو کاتێکـــدا (ئیـــبن عەرەبـــی) ، بـــریتیە لە تێکۆشـــان بەرامـــبەر بە حەز و ئارەزووەکان و شەیتان (مەحمودی مەنوفی)

118. **دۆزەخ : بریتیە لە یەکێک لە مەزنترین بونەوەرەکانی خودا و بریتیە لە زیندان و بەندینخانەی خودا لە دوارۆژدا** (ئیبن عەرەبی) ، **بریتیە لە سروشتی ئاژەڵی** (ئیسماعیل حەقی بروسوی)

119. **برسێتی : بریتیە لە دابڕین و بێبەشکردنی خود لە حەز و ئارەزووەکان** (ڕابیعەی عەدەوی) ، **خۆراکی دونیا نەویستەکانە** (عەبدوڵلای ڕازی) ، **کلیلی دونیانەویستیە بۆ دەرگای دوارۆژ** (ئەبوتالیبی مەککی) ، **خۆراکی خودایە لەسەر زەوی کە سکی ڕاستگۆکان تێر دەکات** (ئەبو عەبدولڕەحمانی سلمی) ، **بریتیە لە ڕۆشنبونەوەی دڵ** (ئیبن عەرەبی)

120. **من حەقم (أنا الحق) : بریتیە لە نەمانی هەبوونت و مانەوەی هەبوونی خودای گەورە ، ئەمەش واتا ئەوە نیە کە تۆ دەبیت بە خودا ، بەڵکو وەک ئاسنێکی کە کاتێک زۆر گەرم بکرێت بە ئاگر ڕەنگ و شێوەی ئاگرەکە دەگرێت بۆیە ئەوکاتە دەکرێت بڵێیت : "من ئاگرم"** (جەلالەدینی ڕۆمی)

121. **رێگـــای ڕاســـتی :** ئەوەیە کە ســـەرەتا بە گەڕانەوە و تەوبە لە تاوانکـاری دەسـت پێـدەکات ، و تـرس لە دواخسـتنی کـارە لەپـێش و گرنگەکـانی پەیوەسـت بە پەرسـتیش ، داوا و پـاڕانەوەیەک کە کەسـەکە جێگیـر بکـات لەسـەر ڕێگـاکەی کە گرتـوویەتیە بەر ، گـوێنەگرتن لە خـود و نەفـس و حەز و ئارەزووەکـان ، گەیشـتنە بە خـودا بە دڵێـک کە تەنها ئەوی تێدا بێت (جونەیدی بەغدادی)

122. **دانـــایی :** بـــریتیە لەو تیـــرانەی لەلایەن خـــوداوە دێـــن و ئامانجەکانیـان دڵـی موریـد و دۆسـتدارانە ، ئەو زاتەشـی تیـرەکەی هەڵـداوە زاتێکـی زینـدوو و بەدەسـەڵاتە کە هەرگیـز بەهەڵە دڵەکـان ناپێکێـت (مەنصـوری حەلاج) ، بـریتیە لەوەی کە لەلایەن خـوداوە بە دڵـت دێـت نەوەک لەلایەن حەز و ئارەزووەکـانتەوە (قاسـمی سـیاری) ، بـریتیە لە چـاوکراوەیی (ئەبـو تـاڵیبی مەککـی) ، ئەو زانسـتەیە کە لەلایەن خـوداوە دەبەخشـرێت (ئەبـو عەبـدولڕەحمانی سلمی) ، بـریتیە لە لێهـاتوویی هێـزی هـزر

و عەقڵ (ئەبو حامیدی غەزالی) ، بریتیە لە ترسان لە خودا (ئەحمەد ڕیفاعی) ، بریتیە لە زانستی پەنهان و نەبینراو (ئیبن عەرەبی) ، بریتیە لە زانست و کارکردن پێی (ئیبن قودامەی مەقدیسی) ، بریتیە لە زانستی زانینی ڕووی ڕاستەقینەی شتەکان و وەسفەکانیان و تایبەتمەندیەکانیان (کەمالەدینی قاشانی) ، بریتیە لە زانینی شتێک و لێهاتوویی تێیدا (ئیبن عەجیبە)

123. **دانایان :** بریتین لە خواناسان (ئیبن عەجیبە)

124. **ماڵی دانایی :** بریتیە لە حەزرەتی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) و حەزرەتی عەلی دەرگای ئەو ماڵەیە

(جەلالەدینی سیوطی)

125. **کەسی دانا :** ئەو کەسەیە کە لە خەملاندن دروست دەپێکێت و لە ئامادەکاریدا ورد و وریایە (حسنین محمد مخلوف) ، پێغەمبەرە (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) چونکە بە دانایی پەیامی خودایی هێنا و زانا بوو بە قورئان و تێگەیشتن لێی

(جەلالەدینــی ســیوطی) ، پێغەمــبەرە (ســەڵەوات لەســەر خــۆی و بنەمــاڵەکەی)

چــونکە بەو ســیفەتە باســکراوە و ئەو ســیفەتەی هەڵگرتــووە (عەبــدولکەریمی

جیلــی) ، ئەو کەســەیە کە بە هــزر و مێشــک خــودا بناســێت (عەلــی کــوڕی

ئەبوتاڵیــب) ، ئەو کەســەیە کە زانســتە خــودایی و سروشــتی و وەرزشــی و

لــۆژیکی کــۆکردبێتەوە کە تەنهــا ئەم چــوار پــلە و پــێگەیە لە زانســتدا

هەیە (ئیــبن عەرەبــی) ، بــریتیە لە خواناســـان و دۆســـتانی خـــودا کە

پێشەوایانی ئەم تەریقەت و ڕێبازەن (کەمالەدینی قاشانی)

126. **دانـای کـات و سـات :** بـریتیە لە یەکێـک لە دوانـزدە جەمســەرە

موحەمەدیەکــان ، کە ســورەتی یاســینی پــێ بەخشــراوە و لەنــاو هەمــوو

جەمســەرەکان دانــاترینە و لەکــات و ســاتی دیــاریکراودا دەردەکەوێــت

و ئەوە دەکات کە ئەو سەردەم و کاتە پێویستی پێیەتی (ئیبن عەرەبی)

127. **بەسەرهاتەکان :** سەربازێکە لە سەربازەکانی خودای گەورە کە دڵی مورید و خوداویستەکانی پێ بەهێز دەکرێت (جونەیدی بەغدادی)

128. **ئەڵقەی زیکر – بازنەی زیکر – بازنەی یادکاری :** بریتیە لە کۆبونەوەی دەروێشان و هەژاران و خوداویستان بۆ ئەنجامدانی یادی خودا بە شێوەی ڕاوەستان یاخود دانیشتنی بەکۆمەڵ بە وێنەی بازنەیەک ، ئەم بازنەی یادکاریانە بنەما و بنچینەیەکی سەرەکین لە بنچینەکانی تەریقەت و ڕێباز و ڕێچکە (کەسنەزانی)

129. **حەڵاڵ – ڕێپێدراو :** ئەوەیە کە بێفەرمانی خودای تێدا نەکرێت (جەعفەری صادق) ، بریتیە لە خودا و بریتیە لە زانست (سەهلی تەستری)

130. **تێچوون – حولول – یەکبوون :** بریتیە لەوەی بزانیت و تێبگەیت لە ڕێگەی ڕونکردنەوەی خوداییەوە کەوا تۆ ئەویت و

ئەویــش تــۆیە بەبــێ ئەوەی یەکێکتــان یەکبگرێــت لەگەڵ ئەوەی تــردا یـاخود بچـنە نـاو یەکتـر چـونکە بەنـدە بەنـدەیە و خـودا خـودایە بـۆیە بەنــدە نابێــت بەخــودا و خــوداش نابێــت بە بەنــدە (عەبـدولکەریمی جیلــی) ، شــتەکان لە بەرامــبەر خــودادا بوونیـان نـیە و تەنهـا خـودا بـوونی هەیە بەمەش ناکرێـت شــتێک یەکبگرێــت لەگەڵ خــودا لەکاتێکــدا هەبــوونی ڕاستەقینە تەنها بوونی خودا خۆی بێت (ئیبن عەجیبە)

131. سوپاســـگوزار : ئەوانەن کە لە خۆشـــی و ناخۆشـــیدا سوپاســـی خــودا دەکەن (ئیـبن عەتـای ئـادەمی) ، ئەو کەســەیە کە ئەگەر خــودا شــتێکی لــێ بگــرێتەوە پێــی وایە بەخشــینە و ئەگەر بەڵایەکــی بەســەر بێنێــت پێی وایە سودمەندیە بۆی (غەوس عەبدولقادری گەیلانی)

132. مــــوحەمەدی ســــەردەم : جێنشـــینی مـــوحەمەدییە خـــاوەنی ڕێنـوێنییە و ئەوەنـدە ڕوونـاکی و ڕۆشـنایی پێـیە کە دەتوانێـت بێبـاوەڕ بکـاتە بـاوەڕدار و تاوانکـار بکـاتە گـوێڕایەڵ و دامـاو بکـاتە پـایەدار و

لاواز بکـــاتە بەهێـــز و هەژار بکـــاتە دەوڵەمەنـــد و ترســـنۆک بکـــاتە

پارێزراو (موحەمەد یەشرطی)

133. **گەمژەیی :** گەورەترین هەژاریە (عەلی کوڕی ئەبوتالیب)

134. **حـــاڵ – دۆخـــداری :** بـــریتیە لە دابەزینێـــک بەســـەر دڵەکانـــدا کە درێـــژە ناکێشـــێت (جونەیـــدی بەغـــدادی) ، ئەوەیە کە بەســـەر دڵەکانـــدا دێـــت (ســـیراجی طوســـی) ، وەک هەورەبروســـکەیە نە پێشـــبینی هـــاتنی دەکرێـــت و نەش کە ڕوویـــدا دەتوانرێـــت پارێزگـــاری لە مـــانەوەی بکرێـــت (عەلـــی ئیـــبن هیتـــی) ، ئەوەیە کە لەخـــوداوەیە (عـــومەر ســـوهرەوەردی) ، گەیشتنی نوور و ڕووناکی و ڕۆشناییە بۆ دڵی خوداویستان (کەسنەزانی)

135. **زینـــدوبوونەوەی ڕوح :** بـــریتیە لە زینـــدووبونەوەی دڵێکـــی مردوو (ئەحمەد سەرهەندی)

136. **زینـــدوو – حەی :** ئەوەیە کە ســـەرەتا و کۆتـــایی نەبێـــت (ئەبـــدو عەبـــدولڕەحمانی ســـلمی) ، ئەوەیە کە ژیـــانی هەبێـــت بەبـــێ جەســـتە و ڕوح

(ئەحــمەد فــایز بەرزنجــی) ، ئەوەیە کە بەیــادی خــوداوە زینــدووە نەک بە هەبوونی خۆی (ئەبوبەکری واسطی)

137. **حەی ئەڵــڵا – کردگــار زینــدووە – خــودا زینــدووە :** واتــا زینــدووی ڕاســتەقینە کە خــودایە ، چــونکە خــۆی ژیــان دەبەخشــێت و ژیــانیش بەهەرچــیەک ببەخشــێت لەکۆتاییــدا دەگەڕێــنەوە بۆخــۆی و تەنها خۆی دەمێنێتەوە (کەسنەزانی)

138. **خۆشەویســتی:** بەردەوامێتــی یــادکردنی خۆشویســتراوە (داودی طــائی) ، ئــاگرێکە بەرد دەتــوێنێتەوە چ جــای دڵ ، ئەگەر ئەو هەســتەت نەبــوو ئەوا تەنهــا بانگەشــەت بــۆ خۆشەویســتی کــردووە (ڕابــیعەی عەدەوی) ، خــاوێنکردنەوەی دڵە لە خۆشویســتراوێک جــگە لە ئەو (شــەقیقی بەڵخــی) ، بــریتیە لە ئــارامبوونەوە بە هەبــوونی خۆشویســتراو ، ســەیرنەکردنی جــگە لە ئەوە لە ترســی ئەوەی دڵ پەیوەســت نەبێــت بە کەســێکی بەدەر لە ئەو (مەعروفــــی کەرخـــــی) ، خــــــۆبەکەمزانینە لە بەردەم

**خۆشویستراودا (بیشری حافی) ، بەردەوامی گوێڕایەڵێتی خۆشویستراوە (حاتەمی ئەصەم) ، بریتیە لە چێژوەرگرتن بە نەهامەتیەکانی لەلایەن خۆشویستراوەوە دێت وەک چۆن چاکەکاری و خۆشیەکانی لەلاوە دێت (ئەبو تورابی نەخشەبی) ، ئەوەیە کە ئەوەت خۆش بوێ کە خودا خۆشی دەوێت و ئەوەت ڕق لێ بێتەوە کە خودا ڕقی لێیە و بەردەوام بیت لەسەر چاکەکاری و خۆت بەدوور بگریت لە هەرشتێک کە لە خودا بێ ئاگات دەکات (ذوالنونی میسڕی) ، دوور نزیک دەکاتەوە و ئاسن نەرم دەکاتەوە و ژەهر شیرین دەکات (سڕی سقطی) ، ئەوەیە کە چەندە زۆر تۆ بەرامبەر خۆشویستراوەکەت شتانێک پێشکەش بکەیت هێشتا پێت کەم بێت و ئەو کەمەی لەلایەن خۆشویستراوەکەتەوە پێشکەشت دەکرێت پێت زۆر بێت (بایەزیدی بەسطامی) ، ئەوەیە کە پێگە و هەبوونێک بۆتۆ نەمێنێت و تەنها پێگە و هەبوونی خۆشویستراوەکەت بوونی هەبێت بەمەش تەنها گوێڕایەڵی**

ئەو بیــت (ســەهلی تەســتری) ، ســڕینەوەی ویســتنە و ســوتانە (ئیبراهیمــی خەواص) ، دڕینــی پەردەی نهێنیەکــانە و نــوقم بــوونە لە دەریاکــان و ســوتانە بە گــڕ (ئەبولحوســەینی نــوری) ، زاڵبــوونی یــادی خۆشویســتراوە بەســەر خۆشویســتەر (جونەیــدی بەغــدادی) ، ڕەزامەنــدیە لە هەمــوو دۆخەکانــدا و ئــارامگرتنە لەســەر ســکاڵانەکردن و ڕەزامەنــدیبوونە بە نەهامەتیەکــان (ڕوەیمــی بەغــدادی) ، دۆخــێکە کە زاڵــدەبێت بەســەر خۆشویســتەر کە تەنهــا خۆشویســتراو دەبینێــت (مەنصــوری حەلاج) ، بــریتیە لە گــوێڕایەڵی فەرمانەکــانی خۆشویســتراو و دورکەوتــنەوە لەوەی کە ئەو ڕێگــری لــێ کردبێــت (ئەبــو عەلــی ڕۆزبــاری) ، ئەوەیە کە پێــت نــاخۆش بێــت کەسێک هەبێــت لە تــۆ زیــاتر خۆشویســتراوی خــۆش بوێــت ، بــریتیە لە جــامی ئەویــن کە تەنهــا کەســی بەوەفــا دەیچەشــێت ، دەریــایەکە بەبــێ کەنــار (ئەبــوبەکری شــیبلی) ، حــاڵەت و دۆخــێکە کە بە نوســین ناتوانرێــت دەربــبڕێــت (قوشــەیری) ، بــریتیە لە مەیلــی سروشــتی مــرۆڤ بــۆ ئەو شــتەی کە چێــژی

پــێ دەبەخشــێت (ئەبوحامیــدی غەزالــی) ، گەیشـــتنە بە خـــودا (غەوس عەبــدولقادر گەیلانــی) ، لە دڵــدا دەچێنــدرێت و گەشــەدەکات بەو ڕادەیەی گرنگــی پــێ بــدرێت (ئەحــمەدی ڕیفـاعی) ، مەســتبوونە (ئەبولبەرەکـاتی ئەمەوی) ، بەرهەمــی زانیــنە چــونکە ئەوەی نەزانێــت ئەوا خۆشەویســتی ناکـات (نەجمەدینــی کــوبرا) ، ئەوەیە کە خــودا دڵــی بەنــدەکان بەتــاڵ بکــاتەوە لە هەمــوو خۆشەویســـتیەک جـــگە لە خـــۆی (ئەبولحەســـەنی شـــازلی) ، کـــوڵانی دڵە (عەبدولســـەلامی مەقدیســـی) ، گەیشـــتنە بە خۆشویســـتراو کە ئەمەش پـــلە و پێگەیەکـــی ســـۆفیگەریە (ئیـــبن ســـەبعین) ، گەشەســـەندنی ئەوینـــداریە (عەبــدولکەریمی جیلــی) ، نابینــایی چــاوە بــۆ جــگە لە خۆشویســـتراو و دەرکردنی هەموو شتێکە لە دڵدا جگە لە ئەو (موحەمەد مەهدی ڕەواس) ،

139. **جــامی خۆشەویســتی :** بــریتیە لە دڵ کە هەمــوو ڕۆژێــک لە دۆخێکی تایبەتدایە (ئیبن عەرەبی)

140. **خۆشەویستی خودایی :** بریتیە لە فریشتەی گیانکێشان چونکە ڕووحی مرۆڤەکان دادەبڕێت لە جەستە و بەمەش حەزە جەستەییەکانیان دەمرێنێت و ڕووحیان پەیوەست دەکات بە خوداوە (ئیسماعیل حەقی بروسوی) ، ناسینی خودایە و سەرقاڵکردنی دڵە پێیەوە و بەردەوام یادکردنیەتی (ئیبن عوسمانی مەککی)

141. **خۆشەویستی لە پێناو خودا :** بریتیە لە گوێڕایەڵی و ملکەچبوون بۆ شێخەکانی تەریقەت و خۆشویستنیان ، هەرکەس گوێڕایەڵیان بێت دەگاتە سەرفرازی و سەربەرزی ، ئەمەش هۆکاری دڵخۆشیە (نورەدینی بریفکانی)

142. **خۆشەویستی خاوێن و پوخت :** بریتیە لە پەیوەستبوونی ڕووح بە خوداوە (عومەری سوهرەوەردی)

143. **خۆشویستەر – ئەویندار :** ئەو کەسەیە کە ئەگەر خۆشویستراو لێی ڕازیبوو ئەوا ستایش و لۆمەکردن و مردن و ژیان و دڵخۆشی و خەمی لەلا دەبێت بەیەکێک (ئەبو عەبدوڵلای جەلاء)

144. **پەتی تەریقەت و ڕێباز :** بریتیە لە قورئانی پیرۆز و شەریعەتی پەیامهێنەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) (کەسنەزانی)

145. **ئیرەیی :** بریتیە لە ویستی لاچوونی ئەو شتانەی کە کەسی ئیرەیی پێ براو هەیەتی (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، بریتیە لە ئازار چەشتنی مرۆڤ کاتێک دەبینێت کەسانێکی تر لە خۆشیدا بن (ئیبن عەرەبی)

146. **چاکەکاری :** بریتیە لەوەی گشتگیر بێت و تایبەتی نەکەیت وەک چۆن خۆر و هەوا و باران گشتگیرن و هەمووان دەگرنەوە (حەسەنی بەصری) ، ئەوەیە کە چاک بێت لەگەڵ بەندەکانی خودا بەوەی خودا پێی بەخشیویت (نەجمەدینی کوبرا) ، لە دوای ئیسلام و

بـــاوەڕدارێتیەوە دێـــت (مەحمـــود فەرکـــاوی) ، پــێگەیەکە لە پێگەکـــانی سۆفیگەرێتی (مـوحەمەدی نەبهـانی) ، بەسـتنەوەی دڵە بە دڵـی شـێخ هەتـاکوو پەیـامهێنەر (سـەڵەوات و سـەلامی خـودای لەسـەربێت) لەویشـەوە هەتـا ڕۆشنایی بەزەیی خودای گەورە (کەسنەزانی)

147. **چاکەکـــار** : ئەوانەن کە لە خۆشـــی و ناخۆشـــیدا پەنـــا دەبەنە خـــزمەت خـــودا (ئەبـوبەکری وەڕاق) ، ئەوانەن کە ڕاسـتێتی شـتەکان دەزانـن (جونەیـــدی بەغـــدادی) ، ئەوەیە کە لەگەڵ خـــۆی چاکەکـــار بێـــت (ئەبـــوبەکری کەتانی) ، ئەوەیە کە هەموو بونەوەران پارێزراو بن لە دڵی (قوشەیری)

148. **خانەقـــا** : دەســـتەواژەیەکی فارســـیە کە بەمانـــای ئەو مـــاڵە دێـــت کە ســـۆفیەکانی تێـــدا دەمێنـــنەوە ، هەروەهـــا بە مانـــای (خنـــق) خنکانـــدنیش دێـــت چـــونکە ســـۆفیەکان حەز و ئارەزووەکانیـــان بەشـــێوەیەک دەمکـــوت دەکەن وەک ئەوەی بیخنکێـــنن (د.عەبـــدولمونعیم حەنەفـــی) ، جۆرێـــک لە پەرســـتگاکانە کە موســـوڵمانان خۆیـــانی تێـــدا بـــۆ

پەرســـــتش تەرخـــان دەکەن و لەســــەردەمی ئەیوبیەکـــانەوە ئەمە ناسرابوو (د.یوسف فرحات)

149. **پـــیس و پـــۆخەڵ :** ئەوەیە کە بـــڕوانێتە شـــتە پیســـەکان بە چاوێکی خاوێن (مەنصوری حەلاج)

150. **خەتەرە – بەدڵهـــاتن – دڵـــخەبەرداری :** بـــریتیە لە بیســـتنی نهێنـــیەک لەلایەن دڵەوە (ئەبولحوســەینی نــوری) ، بـــریتیە لە قســەیەکی نهێنــی کە بە دڵ دێــت (جونەیـدی بەغــدادی) ، خێراتــرە لە چاوتروکانێــک و تەنهــا خوداناســان و پیاوچــاکە زۆر تایبەتەکــان درکـــی پـــێ دەکەن (مــوحەمەدی دەیلەمی) ، هەر شتێکە کە بە دڵدا بێت (د.عەبدولمونعیم حەنەفی)

151. **دڵســۆزی – ئـیخلاس :** بـــریتیە لەوەی کە کارەکــان بە جـــوانی ئەنجــام بـــدرێت و ئەوەش دەبێــتە کلیلـــی قبـــوڵکردنی کــارەکەی و ڕەزامەنــدبوون لەســـەری (جەعـفەری صـادق) ، ڕاســتگۆیی مەبەســـتە لەگەڵ خـــودادا (ئیبراهیمــی ئیـبن ئەدهەم) ، بـــریتیە لە وازهێنـــان لە کــارکردن لە پێنـــاو

خەڵـک ئەگەرنـا دەبێــتە هاوبەشــی دانــان بــۆ خــودا ئەگەر هــاتوو لە پێنــاو خەڵــک بــوو ئەنجامــدانی کارەکــان (فــوزەیڵی عەیــاض) ، ئەوەیە کە کــردەوەی بەنــدەکان لە ڕووکەش و پەنهــان وەکــو یەکتــری لــێ بێــت (حــوزەیفەی مرعەشــی) ، بەرهەمــی بێگومــانبوونە (ســەهلی تەســتری) ، ئەوەیە کە لە هەمــوو کارێکــدا تەنهــا مەبەســت لێــی ڕەزامەنــدی خــودا بێــت (جونەیــدی بەغــدادی) ، لەیــادچوونی تێڕوانینــی بــونەوەرانە بە بەردەوامــی تێــڕوانین لە کردگــار (ئەبــو عوســمانی مەغریبــی) ، بەتــاڵکردنەوەی دڵە لە هەمــووان جــگە لە خــودا (قوشــەیری) ، بــریتیە لە ڕۆشــنایی خوداناســان (ئەحــمەدی ڕیفــاعی) ، ڕوونــاکیەکە کە خــودا دەیخــاتە دڵــی بەنــدە بــڕواپارەکەیەوە و بەمەش پەیوەســـتی دەکـــات بەخـــۆیەوە بە شـــێوەیەک کە نە فریشـــتەیەک بتوانێـــت ببینێـــت ئەو ڕوونـــاکیە تـــاکو بینوســـێت و نەش شـــەیتانێک دەتوانێــت تێکــی بــدات و نەش حەزێــک کە بتوانێــت لەڕێ لای بــدات (ئەبولحەســەنی شــازلی) ، ڕەخســاندنی دڵە بــۆ پەرســتنی کردگــار (ئیــبن عەجیــبە) ،

نهێنـــیەکە لە نهێنیەکـــانی خـــودا کە دەیخـــاتە دڵـــی ئەو کەســـانەی کە خـــۆی بیەوێـــت (عوبەیـــدەی تیشـــیتی) ، تـــاکە ڕێگـــایە بـــۆ ڕزگـــاربوون لە هاوبەشی دانانی پەنهان و شاراوە (سەعیدی نورسی)

152. **دڵســـــۆز :** ئەو کەســــــەیە کە بە پـــــێچەوانەی مامۆســــــتاکەی (پێشـــــەواکەی – گەورەکەی) نـــاجوڵێتەوە نە بە ئاشـــکرا و نە بە پەنهـــان (ئەبـــو حەفســـی حەداد) ، ئەوەیە کە چـــاودێری دڵـــی خـــۆی دەکـــات و تەنهـــا گـــوێڕایەڵە بـــۆ پێشـــەوا و گەورەکەی خـــۆی (ســـەهلی تەســـتری) ، ئەو کەســـەیە کە چاکەکارییەکـــانی دەشـــــارێتەوە هەروەک چـــۆن خراپەکاریەکـــانی دەشـــارێتەوە (ئەبـــو عەلـــی ڕۆزبـــاری) ، ئەو کەســـەیە کە هەمـــوو مەبەســـتی تەنهـــا خـــودایە بەبـــێ هۆکـــاری وەک لابردنـــی ناخۆشـــی یـــاخود ســـودمەندبوون (ئیـــبن عەرەبـــی) ، ئەو کەســـــەیە کە بە تـــــاقیکردنەوە پێکردنـــــی ناگۆڕێـــــت و وەک خۆی دەمێنێتەوە (ئەبولمەواهیبی شازلی)

153. **خەلــيفە – جێنشـــين – جــێگەدار – جێگــر :** بـــريتيە لەو كەســـەی كە شـــوێنی پێغەمـــبەر دەگـــرێتەوە بەو مەرجەی جـــێگەدار هەڵگـری ئاكارەكـانی جێگیـراو بێـت (ئيبن عەلـی ئـامەلی) ، ئەو كەسـەيە كە لە جێگـای شـێخی ڕێبـاز و ڕێگـايە بـۆ ئەنجامـدانی ڕێنـوێنی خەڵـک و ئەنجامـــدانی كـــارە پێويســـتەكان (حوســـەين خاليـــدی) ، ئەو كەســـەيە كە بەرنـــامەی ڕێگـــا و ڕێبـــازەكە دەزانێـــت و جێبەجێـــی دەكـــات و خوداويستان فێر دەكات (كەسنەزانی)

154. **جــێگەداری خــودا :** فەريادڕەســە كە خــودای گەورە بە نــاوە خوداييەكـانی خـۆی پشـتيوانی دەبێـت و كـاری بـۆ دەڕەخسـێنێت (ئەبولحەسـەنی شـازلی) ، جەمسـەری كـاتە و نوێكـاری ئـاينە و شـێخی ڕێچـكە و ڕێبازە (كەسنەزانی)

155. **جــێگەداری ســەر زەوی :** بــريتيە لە خــود و نەفـس ، نە دڵە و نە عەقڵە و نە ڕوح (موحەمەدی نەبهانی)

156. **بـونەوەر :** بـریتیە لە فـۆرم و قاڵبێـک کە ڕوحێکـی تێـدا بێـت (ئەبولعەباسـی مەغریبـی) ، هەمـوو شـتێکە کە شـوێن و خەمڵانـدن بیگـرێتەوە ، بریتیە لە جەستە و تایبەتمەندیەکانی (عەبدوڵلای خضری)

157. **بەدیهێـــنەر – کردگـــار – هێنەرەبـــوون – پەیـــداکار :** ئەوەیە کە بـونەوەران بهێنێـتە بـوون بەبـێ هۆکـار و شـتێک و دروسـتیان بکـات بەبـێ ئەوەی سـودێکیان بـۆی هەبێــت یــاخود نەهــامەتیەکی لەســەر لابـــەن (عەبــدولعەزیز یەحیــا) ، ئەوەیە کە شـــتەکان بهێنێـــتە بـــوون بەبـــێ ئەوەی پێشتر لە وێنەیان هەبوبێت (موحەمەد مائولعەینەین)

158. **چلەکێشـــان :** بــریتیە لە چــل شـــەو و ڕۆژ ، ئەو مــاوەیەیە کە حەزرەتــی موســا لەگەڵ کردگـــار دوا ، هەروەهــا بەو مــاوەیە قــوڕی ئــادەمی پێگەیشـــت تـــاکو ڕوحـــی بچێـــت بەبەردا ، لە نـــاو ڕێبـــاز و ڕێچکەکـــانیش چلەکێشـــان ناوبـــانگی زۆرە و مەرج و ڕێوشـــوێنی تایبەت بە خۆی هەیە (عەبدولغەنی نابلسی)

159. **حەفتەکێشــــان : بـــریتیە لە خۆتەرخـــانکردنی هەفتـــانە بـــۆ بەڕۆژووبــون و پەرســتش و کەمخــۆری و ســەرقاڵبوون بەیــادی خــودا و دورکەوتنەوە لە بەندەکان و ڕووکردنە خودا** (ئەبولهودای صەیادی ڕیفاعی)

160. **مەی : بـــــریتیە لە خۆشەویســــــتی خــــودایی و نهێنیــــــیە کردگاریەکـــان** (ئیـــبن یونســـی خەڵـــوەتی) **، بـــریتیە لە مەســـتبوون بە جـــامی خۆشەویستی خودایی** (د. یوسف زیدان)

161. **تــرس : بــریتیە لە تێکشــکان لە نــاخەوە** (ئیـــبن ئەســـەدی محاســـبی) **، ڕۆشـــنایی دڵەکـــانە کە بەهـــۆیە دەتـــوانن جیـــاوازی لەنێـــوان چـــاکە و خـــراپە بـــکەن** (حەدادی نەیســـابوری) **، فریشـــتەیەکە کە لە دڵـــی خوداناســـان دەنیشـــێت و دەمێنێـــتەوە** (بیشـــری حـــافی) **، بـــریتیە لە ئاگرێـــک لەنـــاو ڕووناکیەکـــدا** (ئەبـــوبەکری واســـطی) **، قـــامچی کردگـــارە کە دەدات لەوانەی بەدڕەوشـــتی دەکەن** (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) **، نائـــارامی بـــوونی دڵە لە ترســـی تـــۆڵەی کردگـــار** (ئەحـــمەد زروق) **، شـــــەرمکردنە لە خراپەکـــاری و**

ڕێپێنەدراوەکـــان (د. عەبــدولمونعیمی حەنەفــی) ، هەســـتکردنە بە کەموکــوڕی و چــاوەڕوانی کردنــی وەرگرتنــی ســزایە لە بەرامــبەر ئەو کەموکــوڕیە (کەسنەزانی)

162. قوتابخـانە – خوێنـدنگا – فێــرگە : بــریتیە لە بــوون ، تێیــدا خــودای گەورە پەروەردگــاری ئەو قوتابخــانەیەیە و فێرخوازەکــانی ناوی فێردەکات (ئیبن عەرەبی)

163. دەروێشـــی : بــریتیە لە دڵ (عەبــدولقادری کەســـنەزان) ، بــریتیە لە زانســتی تەســەوف و دەروون خاوێنکــاری و بــریتیە لەو زانســتەی کە مــرۆڤ دەگەیەنێــت بە ناســینی خــودا و بەســتراوەتەوە بە یــادکردنی خودا (کەسنەزانی)

164. دەروێــش : ئەو کەســەیە کە خــۆی دەناســێت و بەمەش خــودا دەناســێت ، ئەو کەســەیە کە یــادی خــودا دەکــات و خوداویســـتە ،

فێرخــوازە بە زانســتی تەســەوف ، هەژارێــکە لەخــزمەت خــودادا

هاوشێوەی خۆڵە (کەسنەزانی)

.165 **نزاکــردن – داواکــردن – پــاڕانەوە – ویســتن :** بــریتیە لە

سـپاردنی هەمـوو شـتێکی ڕووکەش و پەنهـان بە خـودا (جەعـفەری سـادق) ،

بـریتیە لە وازهێنـان لە تـاوان (بیشـری حـافی) ، بـریتیە لە داواکـردن لە

خـودا بە مەبەسـتی لابردنـی نەهـامەتی و ناخۆشـیەک یـاخود هێنـان و

ڕاکێشانی سود و قازانجێک (حەسەن شەرقاوی)

.166 **دەف :** بـــریتیە لە یەکێـــک لەو ڕێگایـــانەی کە ئەوکەســـەی

یـــادی خـــودا دەکـــات دەبەســـتێتەوە بە یـــادکردنەکە و بە ئاگـــایی و

هۆشــیاری دەیهێڵێــتەوە ، لێــدانی دەف بە دەســت واتــا لێــدانی

دەرگای جوانی خودایی بە دەستی دڵ (کەسنەزانی)

.167 **دونیـا :** بـریتیە لە بـازاڕی دواڕۆژ (حەسـەنی بەسـڕی) ، بـریتیە لە

پــارە و قســە و خەو و خــواردن (مەعروفــی کەرخــی) ، ئەوەیە کە لە دڵ

نزیـــک دەبێـــتەوە و بێئاگـــات دەکـــات لە پەروەردگـــار (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ، دونیـــا خەیـــاڵە و ئەوەی تێیـــدا بەرەو لەنـــاوچوونە (عەبـــدولکەریمی شـــاهی کەســـنەزان) ، خۆشەویســـتی دونیـــا دڵ تێکـــدەدات و دەشـــێوێنێت وەک چۆن گەرمی هەنگوین تێکدەدات (حوسەینی کەسنەزان)

168. سەرســـامبوون : بـــریتیە لە شـــان و شـــکۆی خۆشویســـتراو کە دڵی خۆشەویستان سەرسام دەکات (قوشەیری)

169. یـــادکردن : بـــریتیە لە باوەڕهێنـــان و زانســـت (ئەبـــو ســـەعیدی خـــراز) ، گـــوێڕایەڵیە (ســـەهلی تەســـتەری) ، بـــریتیە لە خـــۆراکی خوداناســـان (عەبـــدوڵلای خـــرازی ڕازی) ، بـــریتیە لە دەرکردنـــی بێئاگـــایی و هۆشـــیاربوونەوە (فـــارس بەغـــدادی) ، بـــریتیە لە ڕزگـــاربوون لە بێئاگـــایی و لەیـــادچوون (عەبـــدوڵلای هەرەوی) ، بـــــریتیە لە دەستبەســـــەرداگرتنی دڵـــــی یادکـــــار لەلایەن یـــادکراوەوە (ئەبوحامیـــدی غەزالـــی) ، پاراســـتنی دڵە لە ڕاڕایـــی دڵ (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ، بـــریتیە لە کردەوەکـــانی دڵ (عـــومەر ســـوهرەوەردی) ، ئەوەیە کە دڵ

پێــی ئــارام و هــێمن دەبێـــتەوە (ئەبولحەســەنی شــازلی) ، دەرگـــای هەرە مەزنــی خــودایە کە کــراوەتەوە لەنێــوان خــۆی و بەندەکانیــدا ئەگەر بەنــدەکانی بە بێئاگــایی ئەو دەرگــایە دانەخەن ئەوا هەمیشــە کــراوەیە (نەوەوی) ، بــریتیە لە شمشــێری خوداویســتان (عەبــدولوەهابی شــەعرانی) ، بــریتیە لە خــاوێنبوونەوە و ڕۆشــنبوونەوەی دڵ (ئیســماعیلی ولیــانی) ، پەتــی گەیشــتنە بە خـــودا (مــوحەمەد مەهــدی ڕەواســی ڕیفــاعی) ، ڕزگـــاربوونە لە یـــادچوون بە بەردەوامـــی ئامـــادەبوونی دڵ لە خـــزمەت خـــودادا (ئەحـــمەد کمشـــخانوی نەقشبەندی) ، ئامادەبوونە لەخزمەت خودادا (ئیبن عەرەبی)

170. **کڕنــوش :** مەبەســت لێـــی بــریتیە لە خــۆبەکەمزانینی بەنــدە لەخزمەت پەروەردگاردا (جەعفەری صادق)

171. **ڕەمەزان :** نـــاوێکە لە ناوەکــــانی خـــــودا کە صــــەمەدە {خۆڕاگرتوو} (ئیبن عەرەبی)

172. **ڕوح : دروستکراوێکن لە دروستکراوەکانی خودا کە لەسەر شێوەی مرۆیی دروستی کردوون ، هەر فریشتەیەک لە ئاسماندا دابەزێت ڕووحێکی لەگەڵە** (ئیبن عەباس) ، **ئەو شتەیە کە جەستە بە زیندوویی دەهێڵێتەوە** (ئەبوبەکری کلاباذی) ، **بریتیە لە تیشکی ڕاستەقینە** (ئەبو عەبدولڕەحمانی سلمی) ، **بریتیە لە بنچینەیەک کە خۆی جێگیر کردووە ، نە لاشەیەکە و نە تەنێکی جێگیر و بەندکراو ، نە لەناو شوێن و ئاڕاستەیەکە و نە بەستراوەتەوە بە جەستەوە و نەش لێی جودایە** (ئەبوحامیدی غەزالی) ، **جێگە و پێگەی خۆشەویستیە** (عومەر سوهرەوەردی) ، **ژیانە لە خودی خۆییدا و ژیانبەخشە بۆ جگە لە خۆی ، بریتیە لە زانست چونکە دڵەکان زیندوو دەکاتەوە** (ئیبن عەرەبی) ، **لە ژێر سنگی ڕاستە بە نزمایی دوو پەنجە** (ئەحمەد سەرهەندی) ، **بریتیە لە بچینەی پوخت و خاوێنی ژیان ، خودی خۆی جێگیرە و سەربەخۆیە** (سەعیدی نورسی)

173. **باوکی ڕووحەکان :** بریتیە لە ڕوحیانەتی موحەمەدی (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) (کەمالەدینی قاشانی)

174. **خوداویست – مورید :** ئەو کەسەیە کە هەموو شتێکی لە دڵی دەرکردووە جگە لە خودا (ئەبو عوسمانی حیری) ، ئەوەیە کە مەبەستی هەر خودایە و لە ڕێگا بەردەوامە هەتا پێی دەگات (مەنصوری حەلاج) ، بریتیە لە ڕۆشنایی و ڕووناکیەک لە ویستراوەوە بۆ خۆداویستان (نەجمەدینی کوبرا) ، ئەو کەسەیە کە حەزە مرۆییەکانی دامرکاون (ئەبولمەواهیبی شازلی) ، هەرکەسێکە کە خودای مەبەست بێت بە ڕاستگۆیی (عەبدولڕەزاقی کنج) ، ئەو کەسەیە کە ڕووناکی و ڕۆشنایی دەبەخشێت بەو شوینەی تێیدا دەمێنێتەوە ، ئەو کەسەیە کە بە ڕووح گەشت بۆ خزمەت خودا دەکات ، ئەو کەسەیە کە ئارامگرتووە و گوێڕایەڵی خودایە و یادی دەکات ، ئەو کەسەیە کە حەزەکانی دادەمرکێنێت (کەسنەزانی)

175. **كەمخۆری :** بریتیە لە شکاندنی حەز و ئارەزووەکان (ئیبن خەفیفی شیرازی) ، بریتیە لە گۆڕینی دۆخە لۆمەکراوەکان بۆ دۆخە ستایشکراوەکان (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، بریتیە لە پێچەوانە ئەنجامدانی حەز و ئارەزووەکان (ئیبن صەخری ئەمەوی) ، بریتیە لە پەروەردەکردنی ڕەوشت و بەرگەگرتنی ئازار (ئیبن عەرەبی) ، خاوێنکردنەوەی دڵە لە پیساییە لۆمەکراوەکان (ئیبن خەلدەون)

176. **شوشە :** لە قورئاندا ئاماژەیە بۆ دڵی مرۆڤ (عەبدولکەریمی جیلی)

177. **زەمزەم :** بریتیە لە جامی گەیشتن بە خودا (عەلی بەندنیجی) ، ئاماژەیە بۆ زانستە ڕاستەقینەییەکان (د.عبدالمنعم حەنەفی)

178. **دونیانەویستی :** ئەوەیە کە گوێ نەدەیت بەوەی دونیا باوەڕدارێک بیخوات یاخود بێ باوەڕێک (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ، دەرگای دواڕۆژە و پارێزەرە لە دۆزەخ ، بریتیە لە وازهێنان لە هەرشتێک کە لە خودا بێئاگات بکات ، بەبێ ئەوەی دڵتەنگ بیت بە

**وازلێهێنـــانەکە و بەبـــێ ئەوەی بە خـــۆت سەرســـام بیـــت کە وازت لێهێنـاوە** (جەعـفەری صـادق) ، **بـریتیە لە ڕازیبـوون بە بەشـی خـۆت** (فـوزەیلی عەیـاض) ، **فریشـــتەیەکە تەنهـا لە دڵە چۆڵکراوەکـان نیشـــتەجێیە** (بیشـری حـافی) ، **بـریتیە لە بەتـاڵی دڵ لەو شـتەی کە لەنـاو دەسـتدا نیـیە ، بـریتیە لە بەتـاڵی سـک لە دونیـا و بەتـاڵی دڵ لە ویسـتنی دونیـا** (جونەیـدی بەغـدادی) ، **بـریتیە لە گـۆڕینی دڵ لە شـتەکانەوە بـۆ خـوای شـتەکان** (ئەبـوبەکری شـیبلی) ، **سـەیرکردنی دونیـایە بە چـاوی کەموکـوڕی** (ئەبولحەسـەنی جوسـقی) ، **یەکەم هەنگـاوی ئەوانەیە کە بەرەو خـودا بەڕێ دەکەون و خۆیـانی بـۆ تەرخـان دەکەن و پشـتی پـێ دەبەسـتن ، هەرکەس پێشـوەختە دونیـا نەویسـت نەبێـت ئەوا ئەوەی بەدوایـدا بونیـادی دەنێـت دروسـت نیـیە و سـەرناگرێت** (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، **خـۆڕاگرتنە لە سـەرقاڵبوون بە حەزەکـانی جەسـتە** (شـەهابەدینی سـوهرەوەردی) ، **کەم حەزلێبـوونە لە پـارە و کەرەسـتە و گەنجینەکردنـی شـتەکان و بەکەم**

ســـــەیرکردنی دونیـــــا و جوانیەکـــــانی و چێژەکـــــانیەتی و بەکەم سـەیرکردنی دەسـەڵاتداران و پـارە و موسـڵک و سـامان (ئیـبن عەرەبـی) ، بەتــاڵبوونی دڵە لە هەرچـــیەک کە جـــگە لە خـــودایە (ئەبولحەســەنی شــازلی) ، بـــریتیە لە لابردنـــی حەز لە شـــتانێک بـــۆ شـــتانێک کە باشـــترن ، بەو مەرجەی ئەو شـــتەی حەزی لەســـەری لابـــردووە شـــتێک بوبێـــت کە حەزی لێـــی کردبێـــت ئەگەرنـــا بە دونیانەویســـتی ناژمێردرێـــت ، وەک کەسـێک کە واز لە خـۆڵ بێنێـت پێـی ناوترێـت دونیـا نەویسـت چـونکە حەزی بـۆ خـۆڵەکە نیـیە (ئیـبن قـودامەی مەقدیسـی) ، سـاردی شـتەکانە لە دڵـدا کە بەشـــێوەیەک نە گرنگـــی بە هەبوونیـــان بـــدات و نەش گرنگـــی بە لەناوچونیـــان (ئەحـــمەد زروق) ، پـــێچەوانەی حەز و ئارەزووەکـــانە (جەلالەدینـــی ســـیوطی) ، بەتـــاڵبوونەوەی دڵە لە پەیوەســـتبوون بە هەرشـــتێک جـــگە لە خـــــودا (ئیـــبن عەجیـــبە) ، وازهێنـــــانە لە ڕێپێـــــدراوەکان چ جـــــای ڕێپێنەدراوەکـــان (مـــوحەمەدی مەجـــزوب) ، یەکەم دەرمـــانە کە خوداناســـان

فەرمـان بە ڕێبـواران بـۆ ڕێگـای خـودا دەکەن پێـی (مـوحەمەد مەهـدی ڕەواس)

،

179. **دونیانەویســـــت :** ئەوەیە کە دونیانەویســـــتیەکەی بە کـــــردار دەســـەلمێنێت (شـەقیقی بەڵخـی) ، ئەو کەســـەیە کە ســـتایش و لـــۆمەکردنی لەلا وەکـــو یەکتـــر دەبێـــت (ئەبوعەبـــدوڵلای ئیـــبن جەلاء) ، کەســـێکە کە خۆشەویـستی دونیـای لە دڵـی دەرکـردووە و پشـتی بە خـودا بەسـتووە (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، ئەوانەن کە پشـت بەخـوا دەبەسـتن لە ژیانیانـدا و ڕەزامەنـدن بە هەمـوو شـتێک ، وازیـان لە دونیـا هێنـاوە و گـوێ نـادەن بەوەی کـی دەیبـات ، ئەوانەن کە وازیـان لە هەمـوو شـتێک هێنـاوە کە لە خـودا بێئاگایـان دەکـات (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، ئەوکەسـەیە کە مـردن لەیـاد ناکـات (ئەحـمەد عیزەددینـی صـەیادی ڕیفـاعی) ، ئەوەیە کە حەزی بە دونیا نییە (قازی زەکەریای ئەنساری)

180. **خەون :** له نیشـانەکانی پەیـامهێنەریه چـونکه خـاوێنی ڕوحـی تێـدا بەدی دەکرێـت (عەبـدولغەنی نابولسـی) ، بـریتیه له سروشـتی بـڕوادار به دابەزینـی پەری (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، به دڵـدا دێـن و وێنـاییەک لەنـاو دڵ دروسـت دەکەن که هەنـدێک جـار لەلایەن شـەیتانەوەیه و هەنـدێک جار لەلایەن خوداوەیه (ئەحمەد کمشخانوی نەقشبەندی)

181. **ڕووبینـی – ڕیـایی :** دلخۆشـبوونه به تێڕوانینـی خەڵـک (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، کـارکردنه له پێنـاو خەڵکـدا بەمەبەسـتی سـودێک یاخود لابردنی زیانێک (ئەبو عەباسی تیجانی)

182. **مەرد :** ئەو کەسـەیه که ئەگەر دانیشـتبێت شـتەکانی بـۆ دێـن ، یـاخود ئەگەر دانیشـتبێت شـتەکان لەگەڵـی دەدوێـن جـا لەهەرکـوێ بـن (بایەزیـدی بەسـطامی) ، ئەوانەن که خـودا له هەمـوو کەموکـوڕیەک بەدووری کـردن و لەهەمـوو گومانێـک بەدووری کـردون (ئەبـوبەکری شـیبلی) ، ئەوەیه که لەنـاو خەڵکـدا دەژی و لەگەڵیـان مـامەڵه دەکـات و تێکەڵیـان

دەبێت بەڵام ساتێک بێئاگا نابێت لەیادی خودا (ئەبو سەعید ئیبن ئەبی ئەلخەیر) ، ئەوەیە کە خەڵک لەبەر خودا کۆ بکاتەوە نەوەک خۆی (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، ئەو کەسەیە کە خۆی وەک کەشتی نوح لێدەکات (ئیبن عەرەبی) ، ئەوەیە کە ڕووکەشی لەگەڵ شتەکانە و لە دڵەوە لەگەڵ دروستکاری شتەکانە ، ڕووکەشی لەگەڵ بەدیهێنراوانە و ناخیشی لەگەڵ بەدیهێنەرە (ئیبن موستەفای موسڵی) ، ئەو کەسەیە کە قۆڵبەستی حەز و ئارەزووەکانی دەکات و زاڵ دەبێت بەسەریاندا (کەسنەزانی)

183. ڕەزامەند بوون : بریتیە لە تیشکی ڕووناکی زانین و بریتیە لە دڵخۆشی (جەعفەری صادق) ، ئەوەیە کە نە بەهەشت لە خودا داوابکەیت و نەش پەنای پێ بگریت لە ئاگر (ئەبو سلێمانی دارانی) ، ئەوەیە کە ئەگەر خودا نەهامەتیەکی بەسەرت هێنا داوای چاکبونەوە نەکەیت (بیشری حافی) ، چێژبینینە لە بەڵا و نەهامەتی (ڕوەیمی بەغدادی) ، سەیرکردنی شتەکانە بە چاوی ڕازیبوون (ئەبوبەکری

واستی) ، دەرکردنــی ڕق و کیــنەیە لە دڵ (ئیـبن تـاهیری ئەبـهەری) ، بەرهەمــێکە

لە بەرهەمەکــانی خۆشەویســتی و بەرزتــرین پــێگەی لەخــودا نزیکــانە

(ئەبوحامیدی غەزالی)

184. **بەرەبەیــان :** ســەرەتای کــردنەوەی دەرگــای بەخشــندەیی

خــودایە لەســەر ڕێبــواران ڕێگــای گەیشــتن بە خــودا (ئیـبن فـارض) ، کـاتی

دەرکەوتنی ڕۆشنایی و ڕووناکی بەخششە خوداییەکانە (عبدالله خضری)

185. **بەخشــــندەیی :** چـــاوەڕێنەکردنی سوپاســـکردنە لەکـــاتی

بەخشــیندا (عەلـی کـوڕی ئەبـو تاڵیـب) ، ڕەفتـار و ئاکـاری پێغەمـبەرانە ، بنـاغەی

ئــاینە ، بــڕواداری ڕاســتەقینە بەخشــندەیە (جەعــفەری صــادق) ، بــریتیە لە

پێشکەشــکردن و پێــدان پــێش داواڵێکــردن (ئەبــو عەبــدولڕەحمانی ســلمی) ،

ئەوەیە کە ببەخشــیت تەنــانەت بە کەســانێکیش کە ناتناســن (قوشــەیری) ،

نێوەنــدگیری نێــوان زیــادەڕۆیی و ڕەزیلــیە (ئەبوحامیــدی غەزالــی) ، پێــدانی

پارەیە بەبێ ئەوەی داوابکرێت یاخود شایستەی بێت (ئیبن عەرەبی)

186. **نهێنــی – پەنهـانێتی – شـاراوە :** پـێگەی ویســتنە (جەعـفەری صـادق) ، ئەوەیە کە لە بەنــــدەکان شـــــاراوەیە (ئەبـــوبەکری واســـطی) ، ئەوەیە کە بەنــدەکان دەبییــنن بەڵام پەری و شــەیتانەکان نــاتوانن ببیــنن (حوســەین صـبیحی) ، بـریتیە لە خەڵـوەت و دوورەپەرێـزی ، ڕۆشـناییەکە لە خـوداوە (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، دەریـایەکە لە دەریاکـانی بەخشـندەیی کە پـڕە لە شـــەپۆلی ورەبەرزی و نە لە ژمـــارە یەت و نەش کۆتـــایی دێـــت (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ، لەنێــــوان ڕوح و دڵ دایە (نەجمەدینــــی کـــوبرا) ، لە ڕووح پیرۆزتـر و بەڕێزتـرە و ئـاوێنەی گەشـانەوەیە بە نـووری خـودا (ئەحـمەدی بونی) ، پـێگەی تێـڕوانینە (عـومەری سـوهرەوەردی) ، بـریتیە لە تەختـی پاشـایەتی ڕوح (عەلی بندنیجی)

187. **دڵخــۆش :** کەســێکە کە ئەگەر شـــتێکی کەمــیش بێـــت لە زانســـتی هەیە (ئیمـامی شـافعی) ، ئەوەیە کە ویســـت و خۆشەویســـتی تێیــدا کۆبـــووەتەوە (یەحیـای ڕازی) ، ئەوەیە کە کارەکـــانی بە خـــودا دەســـپێرێت

(ئیبراهیمـی خەواص) ، ئەوەیە کە سـنووری خـۆی بزانێـت (ئیـبن عەتـای ئـادەمی) ،

ئەوەیە کە بزانێـت کەوا دونیـا خەونە و مـردنە بەئاگـا هـاتنەوەیە (ئیـبن

سەبعین)

188. **مەسـتبوون :** بەردەوام یـادکردنی خـودایە (جونەیـدی بەغـدادی) ،

کـوڵانی دڵە لەکـاتی یـادکردنی خۆشویسـتراو (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ،

بێئاگـایی بەنـدەیە بەهـۆی شـتێکەوە کە وای لێـدەکات جـگە لەو شـتە

شـتی تـر نەبینێـت (ماجد کـوردی) ، پڕبـوونی نـاخە بە شـەرابی خۆشەویسـتی

(ئیبراهیمـی موصـلی) ، لە خۆشەویسـتیەوە دروسـت دەبێـت (ئیـبن ئەنبـوجەی تیشـیتی) ،

وروژانـدنێکە کە لە خۆشەویسـتیەکی بەهێـزی خـوداییەوە دروسـت

دەبێت (مەنصوری حەلاج)

189. **ڕێبـواری ڕێگـا :** ئەوەیە کە پـلە و پێگەکـان دەبڕێـت بە حـاڵ

و دۆخەکەی نەوەک بە زانسـتەکەی (ئیـبن عەرەبـی) ، ئەوەیە کە بەهەمـوو

ویسـت و بـونیەوە ڕوو دەکـاتە خـودا (ئەحـمەد عیزەددینـی صـەیادی ڕیفـاعی) ،

ئەوەیە کە بەرێــگەوەیە بەرەو خــودا (حەیــدەری ئــاملی) ، ئەوەیە کە بــاوەڕ بە هەر قســەیەک دەکــات کە دەرحەقــی وەک لــۆمە بوترێــت (عەلــی کیزوانــی) ، ئەوەیە کە بە تێپەڕیــوونی کــات زیــاتر خــۆبەکەمزان دەبێــت

(قوتبەدینی بەکری دیمەشقی)

190. ســـــتایش – ســــــرودبێژی – گــــۆرانی – خۆشـــــخوێنی –

ستایشــبێژی : زانســتێکە خــودا بەخشــیوبەتی کە هەر خــۆی دەزانێــت چیــە (ســەهلی تەســتری) ، دڵەکــان نــاڕەحەت دەکــات بــۆ ئەوەی پشــت بــکەن لە حەز و ویســــــتەکانیان و ڕوو بــــــکەنە خــــــودا (جونەیـــــدی بەغــــدادی) ، ڕووکەشــەکەی دووبەرەکیــە و نــاخەکەی پەنــد وەرگــرتنە ، ڕێپێــدراوە بیســتنی بــۆ هەرکەســێ چێــژی لــێ ببینێــت و ببێــتە پەنــد بــۆی (ئەبــوبەکری شــیبلی) ، خـــــۆراکی ڕووحەکـــــانە بـــــۆ خوداناســـــان (ســـیراجی طوســـی) ، گەنجینــەیەکە کە تەنهــا هۆشــمەندان تێــی دەڕوانــن (ئەبــو مەدینــی مەغریبــی) ، دەرکەوتــن و ئاشــکرابوونی نهێنیەکــانە بــۆ تێــڕوانین لە خۆشویســتراو

(عیسای کـوڕی غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، بـریتیە لە دڵ و خـودا (ئەحـمەدی ڕیفـاعی)

، نهێنـــیەکە لە نهێنیەکـــانی خـــودا کە دڵەکـــانی پـــێ بونیـــاد دەنرێـــت

(ئەحـمەدی موسـڵی) ، بـریتیە لە دەنگـی خـۆش و چێـژبەخش (عیزەدینـی کـوڕی

عەبدولسەلام)

191. نـاوی هەرە مەزنـی خـودا : کهـیعص (عەبـدوڵلای کـوڕی مەسـعود) ،

بـریتیە لە اللـه بەو مەرجەی بڵێیـت اللـه و لە دڵـت جـگە لە ئەو هیچـی

تـر نەبێـت (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، نـاوێکە کە لە دڵەکـانەوە سـەرچاوە

دەگرێـت (نەجمەدینـی کـوبرا) ، بـریتیە لە {هـو – ئەو} چـونکە نە سـەرەتای

هەیە و نە کۆتـایی (عەبـدولکەریمی جیلـی) ، بـریتیە لە {یـا حەی – زینـدوو}

(غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، بـریتیە لە {قەیـوم – خۆجێگیرکـار} (ئەحـمەدی

سەرهەندی) ، بریتیە لە {عەدل – دادپەروەر} (ئەبوحەنیفەی نعمان)

192. شـــەراب – مەی : ڕۆشـــنایی دەرکەوتـــووە لە جـــوانی

خۆشویســتراو (ئەبولحەســەنی شـازلی) ، بـریتیە لە خـۆ سـپاردن ، ئەو مەیـیەیە

که مانای تێڕوانینی خودایی لەخۆ دەگرێت (عەبدولغەنی نابلسی) ، بریتیە لە یەکخواپەرستی (جەعفەری صادق) ، بریتیە لە عەشق و خۆشەویستی (عەبدولمونعیم حەنەفی) ، سەرسامبوونە (ئەحمەد ئەبو کەف)

193. **هاوبەشی دانان – هاوەڵدانان** : ئەوەیە کە پێت وابێت جگە لە خودا هەیە کە سود و زیانی بەدەست بێت (ئیبن عەتای ئادەمی) ، ستەمکردنە لە دڵ (قوشەیری) ، بریتی نیە تەنها لە بت پەرستن ، بەڵکو حەز پەرستی و شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکانیش دەگرێتەوە (غەوس عەبدولقادری گەیلانی)

194. **سوپاسگوزاری** : بینینی نیعمەتبەخشە نەوەک خودی نیعمەتەکە (ئەبوبەکری شیبلی) ، وەستانە لە خزمەت خودادا تەنانەت هەتاکوو بێدەسەڵاتبوون و سوپاسگوزاریە لە کاتی بێدەسەڵاتبووندا (سری سقطی) ، ئەوەیە کە بێفەرمانی خودا نەکات بەو نیعمەتانەی پێی بەخشیوە (جونەیدی بەغدادی) ، ئەوەیە کە سوپاسگوزاری نەهامەتیەکان

بکـات وەک چـۆن سوپاسـی خۆشـیەکان دەکـات (ئەبـوبەکر ئیبن ئەبـی سـەعدان) ، دانپێـدانانە بە نیعمەتەکـان لە پێنـاو گـوێڕایەڵ بـوون (قوشـەیری) ، ئەوەیە کە نیعمەتەکـان لە پێنـاو ڕەزامەنـدی خـودا بەکاربێنێـت (ئەبوحامیـدی غەزالـی) ، کـوڵانی دڵە بە یـادکردنی خۆشویسـتراو (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، دوورکەوتـنەوە لەوەی نیعمەتـبەخش تـوڕە دەکـات (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، سوپاسـکردنی خـودایە لەوەی لەلایەن ئەوەوە بەخشـراوە (ئیـبن عەرەبـی) ، یەکێکە لە بەشەکانی ڕەوشتبەرزی (کەمالەدینی قاشانی)

195. **حەز و ئـارەزوو :** پەتـی شـەیتانە کە هەرکەس دەسـتی پێـوە بگرێـت دەبێـتە بەنـدەی (ئەبـوبەکری کەتـانی) ، ئەوەیە کە حەزت پێـی بێـت لە دونیـا (ئیـبن عەرەبـی) ، سـەرچاوەی هەمـوو دوبەرەکـیەکە و سـەرچاوەی هەموو خراپەکاریەکە و پەتی شەیتانە (نەجمەدینی ڕازی)

196. **جـۆش و خرۆشـی :** ئەوپەڕی شـتێکە کە مـرۆڤ ناتوانێـت باسـی بکـات (سـەهلی تەسـتری) ، ئەوەیە کە شـوێنەواری خۆشویسـتراو هـانی

بدات (ئەبو عەبدوڵلای شیرازی) ، کڵپەکێشانی دڵە بۆ دیداری خودا (قوشەیری) ، گڕێکە کە لە دەروون دروست دەبێت (ئیبن جەوزی) ، سوتانی لاشە و کڵپەکێشانی دڵ و بڕانی جەرگە (ئیبراهیمی ئیبن ئەعزەب) ، ئاگرێکی خوداییە کە دڵی دۆستەکانی پێ دەسوتێنێت (ڕەشیدی تادفی)

197. **شێخ :** ڕاگرانی زەوین کە ئەگەر ئەوان نەبن ئەوا نەهامەتی و بەڵا بەسەر زەویدا دادەبارێت (قوشەیری) ، ڕێگای گەیشتنن بە خودا و ڕێنیشاندەرن بۆ ئەو و ئەو دەرگایەن کە لەڕێیەوە خەڵک دەگەیەنن بە خودا (غەوس عەبدولقادری گەیلانی) ، سەربازێکە لە سەربازەکانی خودا کە خوداویستان ڕێنوێنی دەکات (ضیائەدینی سوهرەوەردی) ، ئەوەیە کە ئەگەر ئامۆژگاری کردیت تێت دەگەیەنێت و ئەگەر ڕێنوێنی کردیت دەتگەیەنێت و ئەگەر دەستی گرتیت دەتخاتە سەر پێی خۆت و ئەوەیە کە ئاشنات دەکات بە قورئان و سونەت و بەدوورت دەخات لە گومڕایی و سەرلێشێواوی

(ئەحـــمەدی ڕیفـاعی) ، ئەوەیە کە ڕێـــگەی ڕاســـتی گرتـــۆتە بەر و ئاشـــنابووە بە وێــــرانکەر و ڕوخێنەرەکـــان و بەمەش دەتوانێـــت خوداویســـتان ڕێنـــوێنی بکـــات ، بـــاوکی ڕووحیـــیە (نەجمەدینـــی کـــوبرا) ، نـــوێنەر و جێگەدارەکـانی خـودان لەسـەر زەویـدا (ئیبن عەرەبـی) ، بـاوکی نهێنیەکـانە (ئیبراهیمــی دەســوقی) ، نـــوێنەری پێغەمـــبەرە (ســـەڵەوات و ســـەلامی خـــودا لەســـەر خـــۆی و بنەمـــاڵەکەی) ، لەنـــاو خـــودا ویســـتان وەک پێغەمـــبەرە لەناو یاوەرەکانی (کەسنەزانی)

198. **شـەیتان :** بـریتیە لە کـۆکراوەی ئاکـارە خراپەکـان (ئیـبن عەرەبـی) ، ئـاگرێکی نـاپوختە کە تێکەڵبـــووە لەگەڵ تاریکـایی بێبـاوەڕی و لەنـاو مرۆڤەکاندا وەک خوێن هاتوچۆ دەکات (قوتبەدینی دیمەشقی)

199. **ئـارامگرتن :** بـریتیە لە بێـدەنگی (بیشـری حـافی) ، قبـوڵکردنی بەڵا و نەهـــامەتیە بە دڵێکـــی فـــراوانەوە (ئەبـوبەکری وەڕاق) ، پشـــت بەســـتنە بە خــــودا (ذوالنـــونی میســـڕی) ، ئەوەیە کە وەک زەوی بیـــت شـــاخەکان و

مرۆڤەکـان هەڵبگریـت و هەمـوو ئەو شـتانەی لەسـەریەتی و گـوێی پـێ نەدەیـت و بەوە نەڵێیـت نەهـامەتی بەڵکـو بە بەخشـش و پێـدانێک لەلایەن خـوداوە قبـوڵی بکەیـت (سـرِی سـقطی) ، پشـت بەسـتنە بە خـودا (ئیبراهیمـی خەواص) ، هانـدانی خـودە کە لەگەڵ خـودادا بێـت (جونەیـدی بەغـدادی) ، ئەوەیە کە کەسـەکە هـیچ دەنگێکـی لێـوە نەیەت تەنـانەت ئەگەر دەسـت و پـێ و زمانیشـی ببـڕن (مەنصـوری حەلاج) ، وەسـتانە بە ڕوشـتێکی بەرزەوە لەگەڵ ئەو نەهامەتیـانەی ڕووت تێـدەکەن (ئیـبن عەتـای ئـادەمی) ، وازهێنـانە لە گلەیـی و گازنـدەیی کاتێـک نەهامەتیـت بەسـەر دێـت (قوشـەیری) ، پشت بەسـتنە بە خـودا و پەنـاگرتنە پێـی (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، ڕاگرتنـی دڵە لەبەردەم فەرمـان و بڕیارەکـانی خـودادا (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، خـۆڕاگریە لە تورِەبـوون لەکـاتی نەهـامەتی و ڕووداوی نەخـوازراو (شـەهابەدینی سـوهرەوەردی) ، بنچیـنەی عەقـڵە کە

بنچینەی مرۆڤە (عومەری سوهرەوەردی) ، بەرگەگرتنی نەهامتیە لە چاوەڕوانی دەربازبوون لێی (موحەممەد ئیبن وەفای شازلی)

200. سنگ : کانزای خۆسپاردنە (جەعفەری صادق) ، دڵی تێدا نیشتەجێیە و لێیەوە زانستەکان دەردەچن (حارثی محاسبی) ، مەیدانی حەز و دڵە (حەکیمی ترمذی)

201. ڕاستگۆیی : ڕۆشناییە لە جیهاندا و وەک خۆرێکە کە هەموو شتێک ڕۆشن دەکات (جەعفەری صادق) ، بەخشش و هونەرێکە لە لایەن خوداوە بەخشراوە (حارثی محاسبی) ، بریتیە لە نێوەندگیری و دادپەروەری (عومەری مەککی) ، شتێکە کە حاڵ و دۆخەکان بەوەوە تەواو و کامڵ دەبن (جونەیدی بەغدادی) ، پێگەی خوداناسانە (ئیبن عەتای ئادەمی) ، ئەوەیە کە لە حاڵ و دۆخەکانی بەسەرت دێت خۆدەرخستنی تێدا نەبێت و لە بیروباوەڕتدا گومانی تێدا نەبێت و لە کردەوەکانتدا کەموکوڕی تێدا نەبێت (قوشەیری) ، ئەوپەڕی

دڵسۆزیە (ئەبو حامیدی غەزالی) ، ئەو شتومەکی سەفەرەیە کە پێیەوە خوداویستان دەچنە خزمەت خودا (غەوس عەبدولقادری گەیلانی) ، پەیژەی چاودێریکرنە (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، ڕۆشناییەکە خراوەتە دڵی ڕاستگۆکان بەپێی نزیکیان لە خوداوە (نەجمەدینی کوبرا) ، ئەوەیە کە ئاشکرا و پەنهانت وەکو یەک بێت (موحەممەدی مەجزوب) ، وەفاداری و دەروون خاوێنیە (ئەحمەد کمشخانوی نەقشبەندی)

202. نوێژ : پەیوەندیە لەگەڵ خودا بەشێوەیەک کە تەنها خودا دەزانێت چۆنە (ئیبن عەتای ئادەمی) ، دانیشتنی دڵ و مانەوەیەتی لەخزمەت تێڕوانینی خودادا (قوشەیری) ، بریتیە لە میعراجی بڕوادار (نەجمەدینی کوبرا) ، بریتیە لە خاوێنکردنەوەی دڵ (ئیبن عەتای سکندری) ، ڕاوەستانە لەخزمەت خودادا بەشێوەیەک کە هیچ بە خەیاڵ و دڵدا نەیەت لەو ماوەیە جگە لە خودا (عەبدولوەهابی شەعرانی) ، پەیوەندی

نێوان بەندە و خودایە (موحەمەد غازی عرابی) ، بریتیە لە خۆسپاردن و نوێکردنەوەی پەیمان و نیشانی بەندایەتی بوونە (کەسنەزانی)

203. **بێدەنگی :** زمانی ژیریە (قوشەیری)

204. **تەسەوف – ڕووحناسی – دڵخاوێنکاری – ناخکەشکاری – دڵناسین – حەزبەزێنی – دڵکەشکردن – ڕووحچالاکردن – دڵبەهۆشهێنەر – دەروونڕوونبوون – خۆدۆزینەوە – خۆناسین – خواناسین – یەکدڵی :** بریتیە لە قبوڵکردنی ڕاستیەکان و بێهیوابوون لە دەستی بەندە و دروستکراوەکان (مەعروفی کەرخی) ، لە خاوێنکردنەوەی دەروون هاتووە ئەویش پشت دەبەستێت بە وەفاداری (ئەبوبەکری دەقاق) ، ڕەفتارجوانییە و ئامادەبوونی دڵە لەخزمەت خودادا و مەستبوونە بە دیتنی ڕۆشنایی و ڕوناکی خودایی (سری سقطی) ، خاوێنکردنەوەی دڵە لە ڕق و کینە و شوێنکەوتنی پێغەمبەر (سەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی)

(بایەزیـــدی بەســـتامی) ، کەم خـــۆرییە و ئـــارامبوونەوەیە بە یـــادی خـــودا و دوورکەوتـنەوەیە لە خەڵـک لەخـۆ ڕازیکـردن (سـەهلی تەسـتری) ، وازهێنـانە لە حەز و ئارەزووەکـان ، ئـازادی و سـەربەرزی و دەسـت فـراوانییە (ئەبولحوسـەینی نـوری) ، زیکـرو یـادی بەکـۆمەڵ و چێـژبینینە لە ستایشـەکان و کـارکردنە بە کردەوەکـانی پەیـامهێنەر ، خـاوێنکردنەوەی دڵەکـانە و پەیوەسـتبوونە بە خـودا و دڵسـۆزیە (جونەیـدی بەغـدادی) ، ڕێکخسـتنی هەسـتەکانتە و ڕەچـاوکردنی هەناسـەکانتە ، سـەرەتاکەی ناسـینی خـودایە و کۆتـاییەکەی یەکخواپەرسـتی ئەوە ، ئـارامبوونەوەی دڵەکـانە ، مەسـتبوونە (ئەبـوبەکری شـیبلی) ، وازهێنـانە لە مەراقکردنـی شـت زانـین (ئەبوسـەعیدی ئیـبن ئەعرابـی) ، نە زانسـتە و نە کـردارە بەڵکـو ئاکـارێکە کە کەسـی سۆفی دەیپۆشـێت کە زانسـت و کـردەوەی جـوانی هەبێـت (ئەبـو عەبـدوڵلای شـیرازی) ، بـریتیە لە ڕەوشـتە جـوان و پەسـەندەکان (مـوزەفەری قەرەمسـینی) ، ڕاسـتگۆییە لەخـزمەت خـودادا (ئەبولقاسـیمی مقـری) ، وازهێنـانە

لەوەی لە مێشـــــکت دایە و بەخشـــــینە لەوەی لەدەســـــتت دایە و تێکنەچـــوونە لەوەی بەســـەرتدا دێـــت (ئەبـــو ســـەعیدی ئیـــبن ئەبیئەلخەیـــر) ، دەســـتێکی بەتـــاڵە و دڵێکـــی چـــاک و خـــاوێن (قوشـــەیری) ، ڕاســـتگۆییە لەگەڵ خـــودادا و ڕەفتـــارجوانیە لەگەڵ بونەوەرانـــدا (غەوس عەبـــدولقادری گەیلانـــی) ، پشـــت بەســـتنە بە خـــودا و ترســـانە لێـــی لەهەمـــوو کاتێکـــدا و گومـــانی بـــاش بـــردنە پێـــی (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ، ڕاوەســـتانە لەگەڵ ئاکـــارە شـــەرعیەکان بە ئاشـــکرا و پەنهـــان و بـــریتیە لە ڕەوشـــت بەرزی و مـــامەڵەکردن لەگەڵ هەمـــوو شـــتێک بەو شـــێوەیەی گونجـــاوە (ئیـــبن عەرەبـــی) ، ڕاهێنـــانی خـــودە بـــۆ بەنـــدایەتی (ئەبولحەســـەنی شـــازلی) ، هەژاریە لەخـــزمەت خـــودادا (مەحمـــودی فرکـــاوی قـــادری) ، چـــاودێری کردنـــی دڵە (ئیـــبن خەلـــدون) ، زانســـتی چاکســـازیە لە دڵەکانـــدا (ئەحـــمەد زروق) ، وازهێنـــانە لە مەراقـــی شـــت زانـــین و پاراســـتنی نهێنـــیە ئاشـــکرا و پەنهانەکـــانە (ئیســـماعیلی ولیـــانی) ، زانســـتێکە بەهـــۆیەوە دەزانرێـــت چـــۆن مـــامەڵە و ڕەفتـــار بکرێـــت بـــۆ

گەیشـــــتن بە خـــــودا (ئیـــبن عەجیـــــبە) ، گــــوێڕایەڵی فەرمانەکـــــانە و

دوورکەوتـــــــــــنەوەیە لە ڕێپێنەدراوەکـــــــان (ئەبولعەباســــــــی تیجـــــــانی) ،

خـــاوێنکردنەوەی نـــاخە کە بنچیـــــنەی تەصـــەوفە (ئەحـــمەدی مســـــتغانمی) ،

ڕووکـــردنە خـــودایە بە ڕاســـتگۆییانە (مەحمـــودی مەنـــوفی) ، گیانفیـــداییە لە

پێنـــاو ئەنجامـــدانی مافەکـــانی بەنـــدایەتی بـــۆ خـــودای گەورە ئەوەش بە

زاڵبـــوون بەســـەر حەز و ئارەزووەکـــان و نـــوقم بـــوون لە خۆشەویســـتی

خـــودا و پێغەمـــبەرەکەی (فـــاتیمەی یشـــرطیەی حســـنیە) ، وەرزشـــێکی ڕووحـــیە

(مـــوحەمەد متـــوەلی شـــەعراوی) ، دووبـــارە بونیادنـــانەوەی مـــرۆڤە و بەســـتنەوەیەتی

بە پەروەردگـــاری لە هەمـــوو بیـــر و هـــزر و وتە و کـــردار و مەبەســـتێکدا

(موحەمەد زەکی ئیبراهیم)

205. ســـۆفی : ئەو کەســـەیە کە لەخـــزمەت خـــودادا دڵـــی خـــاوێن

کـــردبێتەوە (بیشـــری حـــافی) ، ئەوانەن کە پشـــت بەخـــودا دەبەســـتن (ئەبـــوبەکری

وەراق) ، ئەوەیە کە ئەگەر قســـــە بکـــــات ئەوا قســـــەکانی نهێنیەکـــــانی

دەدرکێنن (ذوالنونی میسری) ، ئەو کەسەیە کە چرای زانستەکەی ناکوژێتەوە و خودا سەرچاوەی نهێنیەکانی بێت و نهێنیەکانیشی لەناو دڵی بن و دڵیشی زاڵبوبێت بەسەر حەز و ئارەزووەکانیدا ، بەم شێوەیە دڵ دەبێتە پادشا و شازادە و حەز و ئارەزووەکانیش دەبنە بەندە و قۆڵبەستکراو ، بەمەش بە یادی خودا مەست دەبێت و دڵخۆشە بە تێڕوانینی خودا بۆ دڵی (سرِی سقطی) ، ئەوەیە کە خودا دڵی خاوێن کردبێتەوە (ئەبو سەعیدی خراز) ، ئەو کەسەیە کە دڵی لە ڕق و کینە خاوێن کردۆتەوە (سەهلی تەستری) ، ئەوانەن کە پشت بەخودا دەبەستن لە هەموو ئەو شتانەی کە تەنها خودا دەیانزانێت (جونەیدی بەغدادی) ، کەسانێکن کە شەرابی عەشقیان پێ دراوە و بەمەش مەست بوون ، بە دیتنێک سەرسام بوونە و لە دەرگای زاتی خودا ماونەتەوە (سەمنونی محب) ، لە خەڵک دابڕاوە و پەیوەستە بە خوداوە ، ئەو کەسەیە کە ناو و نیشانی هەمووی سڕیوەتەوە (ئەبوبەکری شیبلی) ،

ئەو کەسەیە کە دڵی خاوێن کردۆتەوە بە ڕاستگۆیی مەبەستەکەی بۆ خودا و لەپێناو خودادا و جەستەی لە پێناو خزمەتکردنی دۆستانی خودا بەکاردەهێنێت (ئەبولحوسەینی ئەقتەع) ، ئەوکەسەیە کە نوێژ بکات چێژی لێ دەبینێ و بەڕۆژوو بێت سودی لێ دەبینێ و بێدەنگ بێت بیردەکاتەوە و بڕوانێت پەند وەردەگرێت و قسە بکات دانایانە دەیکا و کەمخۆرە و کەمخەوە (بایەزیدی بەستامی) ، پیاوانێکن کە ڕاستگۆن لەسەر ئەوەی پەیمانیان لەسەری داوە (ئەبو عوسمانی مەغریبی) ، ئەوانەن کە سەرقاڵی یادی خودا و بەگوێنەکردنی حەز و ئارەزووەکانیان (ئەبوحامیدی غەزالی) ، ئەوەیە کە نوێژەکەی لەپێناو خودایە و پشتی لە دونیا کردووە (غەوس عەبدولقادری گەیلانی) ، ئەوەیە کە بە خەڵک سەرقاڵ نییە و تەنها دەڕوانێتە خودا (عەبدولقاهری سوهرەوەردی) ، ئەوەیە کە ناخ و ڕوحی لە ڕق و کین خاوێن کردووە و خۆی پێ باشتر نییە لە کەس (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، ئەو کەسەیە کە لەخودا نزیکە

(عــومەری ســوهرەوەردی) ، ئەوەیە کە پشـــت بە خـــودا دەبەســـتێت لە هەمـــوو

کاتێکـدا و میـوانی خـودایە و هۆشـیار و ژیـرە (ئیـبن عەرەبـی) ، ئەوانەن کە

ڕێگـــای خودایـــان گرتـــۆتە بەر ، ڕێگاکەیـــان باشـــترینی ڕێگاکـــانە ،

ڕاسـتترینی ڕێگاکـانە ، ناخیـان باشـترینی ناخەکـانە ، هزریـان باشـترینی

هزرەکـــانە ، خوداناســـن (ئیـبن سـەبعین) ، زانـایەکە کە کـار بە زانسـتەکەی

دەکـــات بە دڵســـۆزی و تەنهـــا مەبەســـتی خـــودایە (عەبــدولوەهابی شــەعرانی) ،

ئەوەیە کە خـــــواردنی وەک خـــــواردنی نەخۆشـــــەکانە و خەوی وەک

خەوی نـوقم بووەکـانە و قسـەکانی وەک قسـەی بێزمانەکـانە (ئەحـــمەدی

مەککــی) ، ئەو کەسـەیە کە هەرچــی لـێ داوا بکرێـت مانـدووی ناکـات و

هـیچ هۆکارێـک نـاڕەحەتی ناکـات (عـوتبە غـولام) ، کەسـێکی دیدەڕۆشـن و

چـــاوکراوەیە ، ورەبەرزە و دانـــایە و پـــایەبەرزە و فێرخـــوازە و تەنهـــا

مەبەســـتی خـــودایە (عەبــدولغەنی نابلســی) ، ئەو بـــونەوەرەیە کە دڵـــی لەگەڵ

خـــودایه و جەســـتەی لەگەڵ بـــونەوەران (ئەحـــمەدی ســـەرهەندی) ، کـــۆمەڵێکن

لە موسوڵمانان کە خەمیان چاککردنەوەی دڵەکانە (موحەمەد عەبدە)

206. **ڕۆژوو :** زەکـــاتی جەســـتەیە (عەلـــی کـــوڕی ئەبـــو تاڵیـــب) ، بێئاگـــاییە لە

بینینـــی بـــونەوەران بە بینینـــی خـــودا (فارســـی بەغـــدادی) ، کلیلـــی دونیـــا

نەویســـتیە و دەرگـــای خـــودا پەرســـتیە چـــونکە حەز و ئارەزووەکـــان

دادەمرکێنێـــت (ئەبـــو تـــاڵیبی مەککـــی) ، گـــرتنەوەی جەســـتە و دڵ لە هەمـــوو

شـــتێک کە خـــودا پێـــی خـــۆش نەبێـــت (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ، خـــۆگرتنەوەیە لە

هەموو شتێک جگە لە خۆشویستراو کە خودایە (ئەحمەدی مستغانمی)

207. **طـــاغوت – ســـتەمکار :** دونیـــایە و لە نەزانـــیەوە دروســـت دەبێـــت

و خـــواردن و خـــواردنەوە بەشـــێکن لێـــی و ڕازانـــدنەوەکەی بـــریتیە لە

خۆهەڵکێشـــان پێـــی و بەرهەمەکەی بێفەرمـــانیە (ســـەهلی تەســـتری) ، هەمـــوو

شـــتێکە جـــگە لە خـــودا (ئەبـــو عەبـــدولڕەحمانی سلمی) ، خـــودی هەمـــوو کەســـێکە ،

هەتـــا بێبـــاوەڕ نەبیـــت بە خـــودی خـــۆت بـــاوەڕدار نابیـــت بەخـــودا چـــونکە

ئەو خــــودە لە خـــودا دورت دەخـــاتەوە (ئەبــو ســـەعیدی ئیـــبن ئەبیلخەیــر) ، هەرشـــتێکە بەنــدە لە خــودا بێئاگـــا بکـــات (قوشــەیری) ، خــودی خــۆتە و ئەوکەســــە ڕزگـــاری لە تـــاغوت بــــووە کە پـــێچەوانەی حەز و ئارەزووەکانی بکات و ڕووبکاتە خودا (نەجمەدینی کوبرا)

208. سروشـــت : دایکـــی هەرە گەورە و بڵنـــدی جیهـــانە و لێـــیەوە دونیـــا دروســـت بـــووە بە فەرمـــانی خـــودایی (ئیـــبن عەرەبـــی) ، بـــریتیە لە کــۆکراوەی گەرمـــی و ســـاردی و شـــێ و وشـــکی (صـــەدرەددینی قونـــوی) ، ڕاســـتیەکی خـــودایە (عەبـــدولقادری جەزائیـــری) ، دروســـتکراوێکی خـــودایە (سەعیدی نورسی)

209. تەپـــڵ : یەکـــێکە لە ڕێگاکـــانی زاڵبـــوون بەســـەر حەز و ئارەزووەکـــان و ڕاکێشـــانی یادکـــارانی خـــودا بـــۆ نـــاو بـــازنەی زیکـــر ، لێــدانی تەپـڵ بە دەســت بــریتیە لە لێــدانی دەرگـای خــودا بە دەســتی دڵ (کەسنەزانی)

210. **دەرکــراو :** ئەوکەســەیە کە خۆپەرســتە و واز لە کــارکردن بە زانستەکەی دەهێنێت (ئیسماعیلی ولیانی)

211. **تەریــقەت - ڕێبــاز - ڕێچــکە - ڕێــگە - پــێگە :** ئەوەیە لەخــودا تەنها داوای خــۆی بــکەی (حەسـەنی بـواجزوی) ، گەڕانەوەیە بـۆ سـەر ڕێگــای چاکەکــاری و چــاودێری خــودا بەســەر دڵەکــانەوە (جونەیـدی بەغـدادی) ، ڕێگەیەکـی ڕووحــیە کە دڵەکــان دەیگــرنە بەر بنچێــنەکەی نــور و ڕۆشــناییەکی ئاســمانی و تیڕوانینێکــی خــوداییە کە دەکەوێــتە ســەر دڵــی بەنــدەکان (ئەبـو مەنصـوری ماتوریـدی) ، ڕاسـتگۆیی و ئــارامگرتنە کە ڕاســتگۆبیت لەگەڵ خــودا و ئارامبگریــت لەگەڵ بەنــدەکانی (ئەبـو سـەعید ئیــبن ئەبــی ئەلخەیــر) ، کــۆمەڵە پــێگە و قۆنــاغیکە کە بە دڵ دەبڕدرێــت نەوەک بە حەز و ئــــارەزوو (قوشـــەیری) ، خۆســــپاردنە (ئیـــبن عەرەبـــی) ، مەبەســــتمەندی خــــودایە (ئەبولحەســـەنی شـــازلی) ، گــــرتنەبەری شــــوێنپێی خوداویســــتانە (کەمــالەدینی قاشــانی) ، بــــریتیە لە ڕێکارەکــــان (ئیســماعیل حقــی

(بروسوی) ، هەڵگرتنی ئاکاری جوانە و دورکەوتنەوەیە لە ئاکاری خراپ

(عەبدولغەنی نابلسی) ، مەبەستمەندی خودایە لەڕێگای فێربوون و

کارکردن (موحەمەد ئیبن حەسەنی سەمنودی) ، ڕاستەڕێگایە کە دەتگەیەنێت بە

خودا (ئەبو فەیزی منوفی) ، نزیکترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە خودا و

کاکڵەی پەرستنە و یەکڕیزیە و خۆسپاردنە و جێبەجێکردنە و

دونیانەویستیە و لەخواترسانە و گوێڕایەڵبوونی خودایە (کەسنەزانی)

212. چاوچنۆکی : بریتیە لە مەی شەیتان کە لەلایەن

لایەنگرانیەوە دەدرێت بە کەسەکە ، هەرکەس بەو مەیە مەست بێت

نایەتەوە هۆش تاکو خودا سزایەکی سەختی ئەدات (جەعفەری صادق) ،

پەیوەستبوونی دڵە بەوەی لە دەستی بەندەکاندایە و لە بنچینەی

درەختی سەرشۆڕیەوە دروستبووە (ئیبن عەجیبە)

213. **طـــور:** ئەوەیە کە بەدڵــدا دێــت لەکــاتی یــادکردنی خــودا و یـادکردنی خۆشەویسـتی خـودا (جەعفەری صادق) ، نـاخی خـۆتە (عەبـدولکەریمی جیلی)

214. **ســـتەمکار :** بـــریتیە لە نەفـــس و خـــود (جەعـــفەری صـــادق) ، ئەو کەســەیە کە داوای ســود لە کەســێک بکــات کە ســودی خــۆی بەدەســت نەبێــت و بیەوێــت نەهــامەتی بە کەسـێک لابـات کە کەسـەکە نەتـوانێ پارێزگـار لە خـۆی بکـا ، هەرکەس بۆخـۆی نەتوانێـت چـۆن بـۆ کەسـی تـر دەتوانێـت (شـەقیقی بەڵخـی) ، خۆپەرسـتیە کە کەسـەکە سـەیری خـۆی بکـــات و خـــۆی ڕازی بکـــات لە دونیـــا و دوارۆژدا (حـــارثی موحاســـبی) ، ئەوەیە کە تەنهـا بە زمـان یـادی خـودا بکـات و بە دڵ غافـڵ و بێئاگـا بێــت (ذوالنــونی میســری) ، ئەو کەســەیە کە شــوێنی حەز و ئــارەزووی خــۆی دەکەوێـــت (ســـەهلی تەســـتری) ، ئەوکەســـەیە کە خۆشـــیاندەوێت لەپێنـــاو دونیـــادا (ئیـــبن عەتـــای ئـــادەمی) ، ئەوانەن کە تەنهـــا لەکـــاتی ناچـــاری نـــزا

دەکەن (ئەبولحوسەینی فارسی) ، پەردە بەسەر چاویان دراوە لە بێ ئاگاییدا و کردەوەکانیان ڕیایی و خۆدەرخستنە و بێئاگان لە یادی خودا و ئەوانەن کە لە دونیادا حەڵاڵ و حەرام هەردووکی دەخۆن (ئەبو عەبدولڕەحمانی سلمی) ، ئەوانەن کە سنووری خودا دەبەزێنن (ئەحمەد کمشخانوی نەقشبەندی)

215. مێشک : بنچینەی درک پێکردنە و دەوری شتەکانی داوە لە هەموو لایەکەوە (عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب) ، ئەوەیە کە بەهۆیەوە خودا بپەرسترێت و بەهەشت بەدەست بهێنرێت (حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب) ، بریتیە لە ڕووناکی دڵ و بەسوودە بۆ درکپێکردن ، ئەو ڕۆشنایيە زیاد دەکات و کەم دەکات ، ئەگەر زیادی کرد و بەهێز بوو ئەوا دەتوانێت چاودێری و تێبینی حەز و ئارەزووەکانی بکات (حارثی محاسبی) ، ئەوەیە کە لە تیاچوون دوورت دەخاتەوە (جەعفەری خلدی) ، سەرچاوەی زانستەکانە و بناغەیانە (ئەبوحامیدی غەزالی) ، جیهانی هەرە

مەزنە (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، بـریتیە لە زانینـی شـتەکان بە بـاش و خـراپ و تەواو و ناتەواویـان (فەخرەدینـی ڕازی) ، لە سـەرەتای ئەو شـتانەیە کە خـودا دروسـتی کـردووە (نەجمەدینـی کـوبرا) ، بنـاغە و بنچیـنەیەکە کە بەش بەش نابێـت (ئیـبن سـەبعین) ، جێگیربـوونە لە شـتەکاندا چـونکە خـاوەنەکەی دەپارێزێـت لە توشـبوون بەو شـتانەی لەنـاوی دەبەن (جەلالەدینـی سـیوطی) ، وەرگێـڕی ڕووحە (ئەحـمەدی سـەرهەندی) ، ڕوونـاکی ڕووحە (عەبـدولعەزیزی دەبـاغ) ، ڕوونـاکیەکە کە بەسـود و زیـانبەخش لەیەکتـر جیـا دەکـاتەوە (ئیـبن عەجیـبە) ، لەلای دانایـان بـریتیە لە ڕوح و لەلای ئەهلـی تەسـەوف بریتیە لە دڵ (عبداللە خضری) ، بریتیە لە ڕۆشنایی دڵ (ئەبولعەزائیم)

216. **ژیـر :** ئەو کەسـەیە کە شـتەکان دەخـاتە شـوێن و پـێگەی خۆیـان (عەلـی کـوڕی ئەبوتاڵیـب) ، ئەو کەسـەیە کە حەڵاڵ و ڕێپێـدراوەکان بێئاگـای نـاکەن لە سوپاسـگوزاری و حەرام و ڕێپێنەدراوەکـانیش زاڵنـابن بەسـەر ئـارامگرتنی (موسـای کـاظم) ، ئەو کەسـەیە کە عەقڵـی

دەیپارێزێ لە هەموو شتێکی نابەجێ (ئیمامی شافعی) ، ئەو کەسەیە کە پشت دەکات لەو شتانەی تایبەت بەو نین و سەرقاڵە بەوەی تایبەتە پێی (ئەبو حەفسی نیسابوری) ، ئەو کەسەیە کە هۆشمەندە بەهۆی پەندوەرگرتن لە سزاکان (غەوس عەبدولقادری گەیلانی) ، خوداناسە ئەگەرچی بە دەمیش کەم یادی خودا بکات (ئیبن عەجیبە)

217. **جیهان :** هەموو شتێکە جگە لە خودا (ئیبن عەرەبی) ، بنچینە و هەستپێکراوەکانە (ئیبن سەبعین)

218. **زانست :** بریتیە لە ڕۆشناییەک کە خودا دەیخاتە دڵی ئەو کەسەی بیەوێت ڕێنوێنی بکات (جەعفەری صادق) ، بریتیە لە کارکردن (بیشری حافی) ، هەمووی ڕووناکیە (سرِی سقطی) ، ئەوەیە کە خودای خۆت بناسیت (جونەیدی بەغدادی) ، هەر شتێکە کە بە بەڵگە پشتڕاست بکرێتەوە و نەزانی لاببات (عەبدوڵلای هەرەوی) ، ئەوەیە کە لە نەزانی ڕزگارت

دەکـات (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، بـریتیە لە بینـین بە چـاوکراوەیی (فەخرەدینـی ڕازی)

، ڕێژەیەکە لە نێوان جیهان و زانیاریەکان (ئیبن عەرەبی)

219. **زانـا :** ئەو کەســەیە کە پـێگەی خـۆی دەزانێــت (عەلـی کـوڕی

ئەبوتاڵیـب) ، ئەو کەســەیە کە زانستەکا دەخـاتە شـوێنی خۆیـان و حەقـی

خۆیـان پـێ دەدات (سـوفیانی سـەوری) ، پزیشـکی ئـاینە (فـوزەیڵی کـوڕی عەیـاض) ،

ئەو کەسـەیە کە زانســتەکەی لە پێنـاو خـودایە (بایەزیـدی بەسـتامی) ، بـریتیە

لە کەسـی دڵسـۆز (ئەبـو سـەعید ئیبن ئەبـی ئەلخەیـر) ، ئەو کەسـەیە کە فێردەبێـت

و کــار بە زانســتەکەی دەکــات (ئەبوحامیــدی غەزالــی) ، ئەو کەســەیە کە

ڕێگای خوداناسان دەگرێتەبەر (موحەمەدی نەبهانی)

220. **جەژن :** هەر ڕۆژێــکە کە بـڕوادار گـوێڕایەڵی خــودای تێــدا

دەکات و سوپاسگوزاری دەکات و یادی دەکات (حەسەنی بەصری)

221. **پەرســتش :** هــونەرێکە کە شــوێنەکەی خەڵــوەت و جلەوگیــریە

و ڕێگاکەشــی خــۆگرتنە لە خــواردن و خــواردنەوە (شــەقیقی بەڵخـی) ،

ڕازێـــنەری خوداناســـانە (ســەهلی تەســتری) ، بە گەورەدانــانی خـــودایە و گــوێڕایەڵی بــوونیەتی و ڕێزگــرتنە لە دۆســتانی خــودا و پەیــامهێنەران و زانایــان و کــارکردنە بە شــەریعەت (ئیـبن مسـکویە) ، نــاوی ڕاســتەقینەی بەنــدەکانە ، خــودی خــۆی و نیشــتیمان و دۆخ و ڕاســتیەتی خۆیــانە (ئیـبن عەرەبــی) ، ئەوپەڕی خۆزەلیــل کــردن و خــۆبەکەمزانینە بەرامــبەر خـــودا (کەماڵەدینی قاشانی) ، خودا ناسینە (حوسەین دوسری)

222. **کلیلی پەرستش :** بریتیە لە بیرکردنەوە (ذوالنونی میسری)

223. **بەنـــدەکاری – بەنـــدەگی – بەنـــدایەتیکردن :** ئەوەیە کە لە هەمــوو حــاڵەت و دۆخێکــدا بەنــدە بیــت وەک چــۆن ئەو لە هەمــوو دۆخێکــدا هەر خــودات دەبێــت (ذوالنــونی میســری) ، ڕازی و ڕەزامەنــدی بــوونە (ســەهلی تەســتری) ، ئەوەیە کە نە ســکاڵات لەســەر کەس هەبێــت و نەش کەس ســکاڵای لەســەرت هەبێــت و خــۆت تەرخــان بکەیــت لە خــزمەت خــودادا (جونەیــدی بەغــدادی) ، تەواوتــرین ئاکــاری بــڕواداره (ئەبـو

عەلـی دەقـاق) ، وازهێنـانە لە هەمـووان جـگە لە خـودا (فەریـدەدینی عەتتـار) ،

وەفـاداریە بـۆ پەیمـان و ڕازیبـوونە بەوەی هەیە و ئـارامگرتنە لەسـەر

ئەوەی نادیـارە (ئەحـمەدی ڕیفـاعی) ، گەیشـتنە بە خـودا و پـایەبەرزبوونە (ئیـبن

عەرەبـی) ، گـوێڕایەڵی فەرمـانی خـودایە و خـۆبەدوورگرتنە لە

ناپەسـەندەکان و گـوێنەدانە بە حەز و ئـارەزوو (ئەبولحەسـەنی شـازلی) ،

خۆسپاردنە بە خـودا و گەڕانەوەیە بـۆ خزمەتـی بە دڵێکـی خـاوێن (ئیـبن

قنفـذی قسـنطینی) ، شـاهیدی دانە بە لاوازێتـی و هەژاری و نەزانـی خـۆت

بە شـتەکان کە هیچـت لەدەسـت نـایەت و پـێ نیـیە بەبـێ خـودا (ئەحـمەد

سعاد العقاد)

224. **بەنـدە** : ئەو کەسـەیە کە گـوێڕایەڵی گەورەکەیەتـی (ئەبـو حەفسـی

نیسـابوری) ، ئەو کەسـەیە کە هیچـێ نیـیە و هـیچ شـتێکیش ناکـاتە مـوڵکی

خـۆی (ئەبـو عوسـمانی نیسـابوری) ، ئەو کەسـەیە کە خـۆی هـیچ ویسـتی نیـیە و

ویسـتی گەورەکەی لەودا جێبەجـێ دەکـات (ئەبـو عەبـدولڕەحمانی سـلمی) ،

گـوێڕایەڵە بـۆ خـودا و خـۆبەکەمزان و زەلـیلە لە خزمەتیـدا (جەلالەدینـی سیوطی)

225. عەرش – تەختـــــی پادشــــایەتی : بـــریتیە لە مـــــرۆڤ ، جـێگەداری خـودایە لە زەویـدا (ئیـبن عەرەبـی) ، بـریتیە لە دڵـی بـڕوادار (کەسنەزانی)

226. زانـین : ڕاسـتیەتی پشـت بەسـتنە بە خـودا (عـومەری کـوڕی عوسـمانی مەککـی) ، خۆتەرخـانکردنە بـۆ خـودا (جونەیـدی بەغـدادی) ، ژیـانی دڵە لەخـزمەت خـودادا (مـوحەمەدی بەڵخـی) ، ڕۆشـناییەکە لە نـاو ڕۆشـناییەکاندا (ئەبـوبەکری واسـطی) ، دانپێـدانانە بە نەزانـین (ئیـبن الاعرابـی) ، لە زمـانی زانایانـدا بـریتیە لە زانسـت ، هەمـوو زانسـتێک زانیـنە و هەمـوو زانینێـک زانسـتە و هەمـوو زانـایەک بە خـودا خوداناسـە و هەمـوو خوداناسـێکیش زانـایە (ئەبـو عەلـی دەقـاق) ، خـۆراکێکە کە خـودا دەیـدات بەو بەنـدانەی خـۆی دەیەوێـت ، تیایانـدایە بەو خـۆراکە چێـژی ڕوحـی

وەردەگرێت و تیایاندایە ڕەوانبێژی وەردەگرێت لێیەوە و تیاندا هەیە خۆڕاگری و ڕەزامەندبوونی لێ وەردەگرێت (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، خەیاڵ و وێنایی کردنی شطەکانە و باوەڕپێهێنانە (فەخرەدینی ڕازی) ، ڕۆشنایی و ڕووناکیەکی خودایە کە دەیهاوێژێتە ناو دڵەکاندا (عیزەدینی کوڕی عەبدولسەلام) ، ئەو زانستەیە کە گومان لەخۆ ناگرێت کاتێک زانست بەخشەکە خودا بێت (قوتبەدینی بەکری دیمەشقی) ، بریتیە لە زانستی لەدوونی (زانستی خودایی) (کەسنەزانی)

227. **سەرچاوەی زانین :** بریتیە لە دڵ (ئەحمەدی ڕیفاعی)

228. **ڕۆشنایی زانین :** بریتیە لە یەکخواپەرستی (حەسەنی گڵەزەردە)

229. **ناسینی ڕوح :** بریتیە لە دڵنیابوون (ئەبو عەبدولڕەحمانی سلمی)

230. **ناسینی پەرستش :** بریتیە لە مەبەست و وتە و کردار بە مەرجی دڵسۆزبوون (عەلی کیزوانی)

231. **خودانــاس :** ئەو کەســەیە کە خــودا بە ڕووح دەناسـێت (عەلـی کـوڕی ئەبوتاڵـب) ، ئەو کەســەیە کە داوای خــودا دەکــات بە دڵ ، بەمەش خـودا دڵێکـی دەداتـێ کە لەهەمـوو کاتێکـدا سـپێدراو بێـت بە خـودا بــۆ ئەوەی پــارێزراو بێــت (ڕابــیعەی عەدەوی) ، ئەو کەســەیە کە لە خەو و هۆشـیاریدا تەنها خـودا دەبینێـت و مەبەسـتی ئەوە و تەنهـا گـوێڕایەڵی ئەوە (بایەزیــدی بەســطامی) ، ئەو کەســــەیە کە نهێنیەکانـــت دەدرکێنێـــت لەکاتێکــدا تــۆ بێــدەنگیت (جونەیـدی بەغـدادی) ، ئەو کەسـەیە کە پێــی وایە تەنهـا خـودا دەیپارێزێـت (ئەبوبەکری شـیبلی) ، ئەو کەسـەیە کە لەپێنـاو خـودا تێدەکۆشـێت (ئەبــوبەکری کلابــاذی) ، دونیــا نەویســتە و دوارۆژ نەویســـتە و تەنهــا خــودای مەبەســتە و جــگە ئەو هیچــی ناوێــت (غەوس عەبــدولقادری گەیلانــی) ، ئەوانەن کە لە زانســـتدا داچەقیـــون (ئەحـــمەدی ڕیفــاعی) ، ئەو کەســـەیە کە لە هەمــوو شـــتێکدا خـــودا دەبینێـــت (ئیــبن عەرەبــی) ، ئەو کەسـەیە کە خـۆی بەکەم دەزانێـت و خـۆی دەسڕێتەوە و تەنهـا داوای

خـودا دەكـات (ئەحـمەد عیزەدینـی صـەیادی ڕیفـاعی) ، ئەو كەسـەیە كە نـوقم بـووە لە ڕۆشـنایی و ڕونـاكی خـودایی (زەكەریـای ئەنسـاڕی) ، ئەو كەسـانەن كە دەزانـن چ گونـاهو تاوانێكـت كـردووە و تێڕوانینیـان هەڵە ناكـات هەر بـۆیە لایـان دامەنیشـن هەتـاكو تەوبە نەكەن لە هەمـوو تاوانێـك (عەلـی خەواص) ، ئەو كەسـەیە كە بە یـادی خـودا هـێمن دەبێـتەوە هەتـاكو لە بـوونەوەران دادەبڕێـت و بەتەواوەتـی ڕوودەكـاتە خـودا (ئیـبن عەجیـبە) ، ئەو كەسـەیە كە دڵـی خـاوێن دەكـاتەوە و خـودا ڕۆشـنایی و ڕوونـاكی بەسەر دەڕژێنێت (كەسنەزانی)

232. **دورەپەرێـزی** : بـریتیە لە دابـڕان لە تێكەڵاویكردنـی خەڵـك (نەجمەدینـی ڕازی) ، خۆڕاهێنـانە لە كەم خـواردن و كەم خەوتـن و كەم وتـن و پاراسـتنی دڵە لە خراپەكاریەكـانی كە بە دڵـدا دێـن (عەبـدولكەریمی جیلی)

233. **عەشــق – ئەویــن :** شــێتبوونە لە پێنــاو خــودادا (جەعــفەری صــادق) ، دڵنیــابوونەوەی مەیلــی حەز و ئــارەزووە بــۆ شــتێکی چێــژ بەخــش (ئەبوحامیــدی غەزالــی) ، تــۆڕێکی خــودابیە کە ئەوانە ڕاو دەکــات کە بەوەفــا و دڵســۆزن (ئەحــمەدی ڕیفــاعی) ، ئــاگرێکە کە جەرگ و هەنــاو ئــاگر دەدات و مێشــک لەکــار دەخــات و بینــایی کــوێر دەکــات و گــوێ کەڕ دەکــات بەمەش کەســەکە ڕوودەکــاتە ئەوینــدارەکەی (نەجمەدینــی کــوبرا) ، دودڵــی بەردەوامە (ئەحــمەد عیزەدینــی صــەیادی ڕیفــاعی) ، زێــدەڕۆییە لە خۆشەویســتیدا (عەبــدولغەنی نابلســی) ، خۆشەویســتی پــوختە و خوداناســی تەواوە (جەلالەدینــی ڕۆمی)

234. **بێفەرمـــــــانی :** بـــــــریتیە لە پەردەیەک کە تەنهـــــــا بە پاشــگەزبوونەوە و گەڕانەوە لادەچێــت (ئەبوحامیــدی غەزالــی) ، گــوێڕایەڵی نەبــوونی فەرمانەکــانی خــودایە (ئەحــمەد زروق) ، بێئاگــاییە لە خــودا (ئەبــو شاماتی یەشرطی)

235. نــــامۆ – نەناســـــراو : ئەو کەســـەیە کە ئەگەر خەڵـــک داوای بـــکەن نایـــدۆزنەوە و ئەگەر دۆزەخ نشـــینان داوای بـــکەن نایـــدۆزنەوە (بایەزیـــدی بەســـطامی) ، ئەو کەســـەیە کە لە جیهانـــدا بەشـــی نیـــیە (ئەبولحەســـەنی قەناد)

236. پەیوەســــــــتبوون – پەیوەنـــــــدبوون : ئازارچەشــــــــتنە لە خۆشەویســــــتیدا (عەبـــدولغەنی نابلســـی) ، ورروژانـــــدنە لە ڕێگـــــای مەی خۆشەویستیەوە (عەبدولمونعیم حەنەفی)

237. تـــورەیی : کڵـــپەی ئـــاگرێکە کە لەو ئـــاگرانە ســـەرچاوەی گرتـــووە کە لە نـــاو ناخـــدا هەن (ئەبوحامیـــدی غەزالـــی) ، کـــوڵانی خـــوێنە بە مەبەستی تۆڵە سەندنەوە (ئەحمەدی ڕیفاعی)

238. بێئاگـــــا : ئەو کەســـەیە کە خـــودا ناپەرســـتێت وەک ئەوەی ببینێـــت (ســـەهلی تەستری) ، ئەو کەســـەیە کە بێئاگـــایە لە مەبەســـت و ویســـتی

خـودا (ئەبـو عەبـدولڕەحمانی سـلمی) ، ئەو کەسـەیە کە خـودا ناناسـێت ئەگەرچـی زۆریش بە زووبان یادی بکات (ئیبن عەجیبە)

239. **بێئاگـــایی** : یـــادکردنی خـــودایە تەنهـــا بە زووبـــان (بایەزیـــدی بەســـطامی) ، ڕەشـــبوونی دڵە (ســـەهلی تەســـتری) ، ســـزای دڵە و پەردەیەکە بەســـەر دڵـدا (ئەبـو عەبـدولڕەحمانی سـلمی) ، شـوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکـانە (شەریفی جرجانی)

240. **غەوس – فەریـــــادڕەس – بەهانـــــاوەچوو** : لە هەمـــــوو ســـەردەمێکدا یەک کەســـە (ئیـبن عەرەبـی) ، جـێگەداری خـودایە لە زەویـدا (ئەبولحەســـەنی شـــازلی) ، ئەو کەســـەیە کە خـــودا کردوویەتـــی بە ڕەحـــمەت و بەخشـــندەیی بـــۆ هەمـــوو شـــتێک (ئیـبن قەزیـــی ئەلبـان) ، پیـــاوێکی مەزن و گەورەیە کە خەڵـک لەکـاتی ناچاریـدا هانـای بـۆ دەبەن و داوای نـزا و پاڕانەوەی لـێ دەکەن چـونکە نـزا و پـاڕانەوەی قبـوڵە (ئەحـمەدی شـازلی) ، جـێگەداری پێغەمـبەرە (سـەڵەوات لەسـەر خـۆی و بنەمـاڵەکەی) (عەلـی

بندینجی قادری) ، ئەو جەمسەرەیە کە پەنای بۆ دەهێندرێت (عەبدوڵڵای خضری)

241. **فەریادڕەسی هەرە مەزن :** بریتیە لە نازناوی حەزرەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و خودا ئەو نازناوەی پێ بەخشیوە (کەسنەزانی)

242. **پەنهان :** بریتیە لە خودا (سەهلی تەستری) ، ئەوەیە کە هیچ کەسێک ناتوانێت ببینێت (قوشەیری) ، ئەو شتەیە کە بە هەستەوەرەکان ناتوانرێت درکی پێ بکرێت بەڵام عەقڵ دەزانێت کە هەیە جا بە بەڵگە بێت یاخود بە هەواڵێکی ڕاست ، ڕوحی جیهانی مەزنە کە جیهان لێیەوە دەرچووە ، هەموو شتێکە کە خودا لە مرۆڤی شاردبێتەوە (ئیبن عەرەبی) ، ئەوەیە کە لە هزری مرۆیی نادیار بێت کە ئەویش خودایە (عەبدولغەنی نابلسی)

243. **دڵ :** شـوێنی تێڕوانینـــی خـــوداییە (جەعـفەری صـادق) ، دەریــای بینیـــنە (یەحیـای کـوڕی مەعـاذ) ، ئەو ڕوحەیە کە ئـارام دەبێـــتەوە (ئەبولعەباسـی تیجانی)

244. **ئاشوب – فیتـنە – ئـاژاوە :** سـوێند بە خـودا سزای خـودایە کە توشـی بەنـدەکانی دەبێـت کاتێـک بێفەرمـانی بـکەن و تەمەڵـی بـکەن لە پەرسـتنی (حەسـەنی بەصـری) ، سـەرقاڵبوونە بە جـگە لە خـودا (ئەبولحوسـەینی نوری) ، تاقیکردنەوەیە (ئیبن عەرەبی)

245. **هەژاری :** مردنـــی هەرە گەورەیە (عەلـــی کـــوڕی ئەبوتاڵیـــب) ، ئەوەیە کە داوای شــتانێک نەکەی کە لەنـاو دەچـن بـۆ ئەوەی ئەوە لەدەسـت بـــدەی کە هەیە (ڕوەیمـــی ئیـــبن ئەحـــمەد) ، خـــاوێنکردنەوەی دڵە لە پەیوەســتبوون بە شــتەکان و ڕووکــردنە خــودایە (بقـا بـن بطـوی عراقـی) ، مـردنێکە کە هەنـدێک خەڵـک داوا دەکەن کە تێیـدا بـژین ، بـریتیە لە هەژاری لەخـــزمەت خـــودادا و مەبەســـت لێـــی ئەوەیە کە دڵ تەنهـا

خــودای تێــدا بمێنێــت (غەوس عەبــدولقادری گەیلانــی) ، ئــارامگرتنە لەســەر ناخۆشــیەکان و سوپاســگوزاریە لە خۆشــیەکان (ئیــبن ســەبعین) ، بــڕینەوەی دەســتی دڵە لە دونیــا و ئــارەزووکردنی دونیــا (ئیــبن یوســفی سنوســی) ، تیمارکردنی دڵە لە سکاڵاکردن (ئیبن عەجیبە)

246. **هەژار :** ئەو کەســەیە کە دەزانیــت پێویســتی بە خــواردنەکەتە ئەگەرچــی خۆیشــی داوای نەکــات (ئیــبن عەتــای ئــادەمی) ، ئەوانەن کە لەخــزمەت خــودادا ڕاوەســتاون و ڕازی و ڕەزامەنــدن بەوەی کە هەیە (مەنصــوری حەلاج) ، ئەو کەســەیە کە تەنهــا بە خــوداوە دەوڵەمەنــدە (ئەبــوبەکری شــیبلی) ، ئەو کەســــەیە کە هەژاریەکەی دەشــــارێتەوە و ڕازیە پێــــی و دڵخۆشــە پێــی (عەلــی ئیــبن بەنــداری صــیرفی) ، ئەو کەســەیە کە هەبــوونی شــتەکان دەوڵەمەنــدی نــاکەن و نەبوونیــان هەژاری نــاکەن (مــوحەمەدی مســوحی) ، ئەو کەســەیە کە هیچــی نیــیە و هیچــیش ئەوی نیــیە (ئەبــو ســەعیدی قیلــونی) ، ئەو کەســــەیە کە ئــارام دەگرێــت و بەمەش چــاوچنۆکیەکەی

کەم دەکـــات (مەکـــارمی نەهرمــولکی) ، ئەوانەن کە بە خـــودا دەوڵەمەنـــدن و وازیـــان لە جـــگە لە ئەو هێنـــاوە (نەجمەدینـــی کـــوبرا) ، ئەو کەســـەیە کە وتەکـانی هاوسـەنگن و زمـانی پـاراوە و دڵـی تەنـگە (ئەبـو هـودای صـەیادی ڕیفـاعی) ، ئەو کەسـەیە کە لە سـەروو پـێگەی خـۆیەوە قسـە ناکـات (عەلـی نورەدینی یەشرطی)

247. **قورئـــان :** پەتـــی خـــودایە لە نێـــوان خـــۆی و بەنـــدەکان کە هەرکەس دەســـت بەو پەتە بگرێـــت ڕزگـــاری دەبێـــت (ســـەهلی تەســـتری) ، بـریتیە لە ڕوحـی بـاوەڕدارێتی (ئەبـو تـاڵبی مەککـی) ، بـریتیە لە فەرمایشـتی خـودا ، کە کـۆنە و نەگـۆڕاوە و دروسـت نەکـراوە و نـوێ نیـیە (قوشـەیری) ، دەریـای هەمـوو داناییەکـانە بەڵام گـوێیەکی هۆشـیار نیـیە ئەو داناییـانە بـــدۆزێتەوە (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ، هەواڵەکـــانی خـــودایە و پەیـــامهێنەرێتی هەمـوو تێـدا کـۆ بـووەتەوە چـونکە کـۆکراوەی هەمـوو ئەو شـتانەیە کە خـــودا دەیەوێـــت بە بەنـــدەکانی بڵێـــت (ئیـــبن عەرەبـــی) ، بـــریتیە لە

فەرموودەکـانی پەیـامهێنەر (سـەڵەوات لەسـەر خـۆی و بنەمـاڵەکەی)

کە ئەوەش شەریعەتەکەی دەگرێتەوە (کەسنەزانی)

248. **جەمســەر – قوتــب :** بــریتیە لە فەریــدرِەس و لە هەمــوو

سـەردەمێکدا جێگـای تێڕوانینـی خـودایە و لەسـەر دڵـی ئیسـرافیلە (ئیبن

عەرەبی) ، جەمسـەری جیهـانە (بـالی ئەفەنـدی) ، ئەو کەسـەیە کە هەمـوو حـاڵ

و دۆخ و پێگەکــانی کــۆکردۆتەوە (عەبــدولوەهابی شــەعرانی) ، بــاڵاترینی

دۆســـتانی خـــودان و تایبەتمەنـــدن (عەبـــدولقادری جەزائیـــری) ، ئەو

پەروەردەکـار و مامۆسـتایەیە کە دەسـتی ڕێبـوارانی ڕێگـا دەگرێـت

هەنگـــاو بە هەنگـــاو و دەیانپارێزێـــت لە هەڵە و لادان هەتـــا

دەیانگەیەنێتە پێگەی کامڵ بوون (موسا صەدر)

249. **دڵ :** پـێگەی زانینـە (جەعـفەری صـادق) ، خـاوەنی ئەنـدامەکانی

جەسـتەیە و زاڵە بەسـەریاندا ، ئەگەر زانـین و عەقـڵ زاڵ بـبن

بەسـەریدا دەکەوێتە سـەر ڕێگـای ڕاست و ئەگەر حەز و ئـارەزوو زاڵ

**بـبن بەسـەریدا لە خـودا دوور دەکەوێـتەوە** (حەکیمـی ترمـذی) **، شـازادەیەکە کە عەقــڵ و ڕوح و حەز و ئارەزووەکــان کۆدەکــاتەوە** (سـەهلی تەسـتری) **، شــوێنی ڕۆشــنایی و ڕوناکیەکــانە** (بنــدار شـیرازی) **، شــوێنی تێڕوانینــی خـودایە بـۆ بەنـدەکەی** (ئیـبن عەبـدولجەباری نفـری) **، گەنجینـەی خـودایە لەلای بەنـدەکان** (ئەبـدو عەبـدولڕەحمانی سـلمی) **، ڕوحـی مـرۆڤە و زانینــی تێـدایە ، تەختــی پادشــایەتی و عەرشــی خــودایە و ســنگ کورســیەکەیەتی و بەشــەکانی تــر جیهــان و شانشــینەکەین** (ئەبـو حامیـدی غەزالـی) **، بـریتیە لە نهێنــی و پەنهــانی** (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) **، شـوێنی نهێنــی و پەنهــانێتیە** (عیسـای کـوڕی غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) **، بنچینەیەکـی تـاریکە کە خـۆڵی بـێ ئاگــــایی داپۆشـــــیوە ، لاچـــــوونی خـــــۆڵەکە بە بیرکـــــردنەوەیە و ڕوونــاکبوونەوەی تــاریکیەکە بە یــادی خــودایە و شــوێنی هەڵگرتنــی دڵەکە بــریتیە لە ئــارامگرتن** (ئەحــمەدی ڕیفــاعی) **، شــوێنی جیــاکردنەوە و هەڵبــژاردنە و هەمــوو ئەنــدامەکانی تــر لە ژێــر فەرمــانی ئەودان**

(فەخرەدینی ڕازی) ، لە دۆخێکەوە دەگۆڕێت بۆ دۆخێکی تر بۆیە نیاندارە (نەجمەدینی کوبرا) ، شوێنی زانینە (عومەری سوهرەوەردی) ، گەورەی جەستەیە و لە جەستەی مرۆڤدا ئەو قسە دەکات ، ئەو هێزەیە کە لە پشت شاخی عەقڵەوەیە (ئیبن عەرەبی) ، تەختی پادشایەتی ڕوحە لە جیهانی پەنهانیدا (ئیب ئەحمەدی فرغانی) ، مەبەست لێی ئەو پارچە گۆشتە نییە کە هەیە ، بەڵکو نیاندارێکە لە خودا لە جەستەدا داینـاوە (ئیبن عەتای سکندری) ، بنچینەیەکی ڕۆشنە کە لەنێوان ڕوح و خود دایە ، پەنهانەکەی ڕووحە و حەز و ئارەزووەکانیشی ڕووکەشەکەین (کەمالەدینی قاشانی) ، لەنێوان ڕوح و خود دایە (عبداللطیفی قورەیشی) ، ئاوێنەی گەشانەوەیە (موحەمەدی شازلی) ، ئەو شوێنەیە کە لە ڕێیەوە بەندە خودا دەناسێت و خۆشی دەوێت (ئەحمەد زروق) ، نیوەی لە جیهانی بونەوەراندایە و نیوەی لە جیهانی ڕوح (ئەحمەدی سەرهەندی) ، شوێنی زانینی ڕاستەقینەیە (عەبدولغەنی نابلسی) ، شوێنی خوداناسینە

(حیجـــازی موســـڵی) ، شـــوێنی یـــادکردنی خـــودایە (ئیـــبن عەجیـــبە) ، شـــوێنی

بـاوەڕدارێتی و خوداناســی و دابەزینــی ڕوونــاکی خــوداییە و هەڵگــری

نهێنـــیە خوداییەکـــانە هەر بـــۆیە پێویســـتە خـــاوێن بکـــرێتەوە بە زۆر

یـادکردنی خـودا (شـەهابەدینی ئالوسـی) ، سـەرچاوەی هێـزی سروشـتی مـرۆڤە

و دواتـــر ئاکـــار و ڕەوشـــت و کردارەکـــان (ئەحـــمەدی کمشـــخاتوی نەقشـــبەندی) ،

بـــریتیە لە تەختـــی پادشـــایەتی و عەرش و تـــابلۆی پـــارێزراو {لەوحـــی

مەحفوز} (موحەمەد ئەبولعەزائیم)

250. **دڵەڕاوکێـــی :** ئـــارام نەبـــوون و ترســـە لە پێنەگەیشـــتن (ســـولەیمانی

خەلوەتی)

251. **قەڵەم – پێنـــووس :** فریشـــتەیەکە لە فریشـــتەکان کە خـــودا

وەک نوســـەرێک هەڵـــی بـــژاردووە و ئەو زانســـتەی بیەوێـــت فێـــری

دەکـــات (ئیـــبن عەرەبـــی) ، زانســـتی زێـــدەزانیاریە (شـــەریفی جورجـــانی) ، پـــێگەی

**پێـــزانینە (عەبـدولکەریمی جیلـی) ، بــریتیە لە ڕوحـــی مــوحەمەدی (سـەڵەوات لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی) (عەلی بندنیجی قادری)**

252. **مانـک : ڕوونـــاکی و ڕۆشـــنایی چـــاوی ســـەرە (ســەهلی تەسـتری) ، لەئەســتۆهەڵگری لەشــکری بــونەوەرانە (غەوس عەبــدولقادری گەیلانــی) ، نازنــاوی خوداناسانە (عەبدولغەنی نابلسی)**

253. **ڕەزامەنـدیبوون : سـامانێکە کە تەواو نابێــت (عەلـی کـوڕی ئەبوتاڵیـب) ، فریشـــتەیەکە کە تەنهـــا لە دڵـــی بـــڕواداران هەیە (بیشـــری حـــافی) ، ڕازیبـــوونە بەوەی خـــودا وەک ڕۆزی داویەتـــی (حەکیمـــی ترمـــذی) ، بەسبوونە بەوەی پێویسـتە بـۆ ژیـان و قبـوڵکردنیەتی بـۆ ژیـانێکی سـادە و شـــوێننەکەوتنی بەدەســـتهێنانی پـــارەی زیـــاتر و پـــێگەی زیـــاترە ئەگەرچـــی حەز لە هەمـــوو ئەوانەش بکـــات ، بەمەش خـــۆی زاڵ دەکـــات بەســـەر حەز و ئارەزووەکانیـــدا (ئیـــبن عەرەبـــی) ، دەرچـــوونە لە**

حەزە خودییەکـــان و چێـــژە ئاژەڵیەکـــان (نەجمەدینـــی ڕازی) ، ڕزیبـــوونە بەوەی هەیە (حیجازی موسڵی)

254. کەســـــنەزان : واتـــا ئەو نهێنـــــیەی کە تەنهـــا خـــودا و پەیـــامهێنەرەکەی و شـــێخی ڕێبـــازەکە دەیـــزانن و بـــریتیە لە نهێنـــی هەرەمەزن (کەسنەزانی)

255. شـاهی کەسـنەزان – پادشـای نهێنیەکـان – سـانی پەنهانـان – پاڵشـای پەنهـان : بـریتیە لە نازنـاوی شـێخ عەبـدولکەریمی یەکەمـی کەسـنەزانی کە ڕێبـازی پیـرۆزی کەســنەزانی بـۆ ئەو دەگەڕێـتەوە و لەویشـەوە بـۆ شـێخ عەبـدولقادری گەیلانـی و لەویشـەوە بـۆ ئیمـامی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (کەسنەزانی)

256. کەعبە : بریتیە لە دڵ (ئیماعیل حەقی بروسوی)

257. **بێبـــاوەڕ :** ئەوەیە کە خـــودا بە جەســـتە بناســـێت (عەلـــی کـــوڕی ئەبوتاڵیـــب) ، ئەو کەســـانەن کە بێبەشـــن لە بینینـــی خـــودا و گەیشـــتن پێـــی (موحەمەد غازی عرابی)

258. **کیمیـــا :** بـــریتیە لەو زانســـتەی تـــایبەتە بە پێـــوانە و پێوەرەکـــان لە هەمـــوو شـــتێکدا کە دەچێـــتە ژێـــر بـــاری کێشـــکردن و بەرکەوتـــن ، زانســـتێکی سروشـــتی ڕوحیـــی خـــودایە (ئیـــبن عەرەبـــی) ، قایـــڵ بـــوونە بەوەی هەیە و وازهێنانە لە بەپەرۆشبوون بۆ ئەوەی کە نییە (کەمالەدینی قاشانی)

259. **کیمیـــــای دڵخۆشـــــی :** بـــــریتیە لە ڕاهێنـــــانی خـــــود بـــــۆ خـــــۆبەدوورگرتن لە خراپەکـــــاری و خـــــاوێنکردنەوەی خـــــودە و بەدەستهێنانی جوانی و شکۆمەندیە بۆ خود (کەمالەدینی قاشانی)

260. **کیمیـــــای تایبەتمەنـــــدان :** ڕەخســـــاندنی دڵە لە گەردوونـــــدا لە خزمەت بەدیهێنەری گەردوون (کەمالەدینی قاشانی)

261. **زانستی کیمیا :** زانستی مادەکانە (ئیبن عەرەبی)

262. **لاهـوت – خـودایی : بـریتیە لە جیهـانی نهێنیەکـان** (نـورەدینی بریفکانی)

263. **زمـان : بـریتیە لە دەریـای زانسـتە ڕاسـتەقینەکان** (قوشـەیری) ، **پێنوسی دڵە** (ئیبن عەرەبی)

264. **زیـادەڕۆیی : هەرکەسـێکە کە لە وتەکانیـدا دانـایی نەبێـت** (حەسـەنی بەصـری) ، **ئەوەیە کە خودەکـان حەزی پـێ دەکەن** (ئەبـو حەفسـی حەدادی نیسـابوری) ، **باسـکردنی بـونەوەرانە** (حەمـدونی قصـار) ، **هەر شـتێکە کە حەز و ئـارەزوو بەشـی تێیـدا هەبێـت** (ئەبـو عوسـمانی حیـری نیسابوری) ، **ئەوەیە کە پاداشـتی لەسـەر نیـیە** (یوسـفی ڕازی) ، **هەرشـتێکە لە سـەرقاڵت بکـات لە خـودا** (ئیـبن عەتـای ئـادەمی) ، **ئەوەیە کە لەخـودا بێئاگـات بکـات و ئەوەیە کە لە دڵێکـی بێئاگـاوە دەردەچێـت** (قوشـەیری) ، **هەمـوو کـردارێکە کە لەپێناو خودا نەبێت** (نەجمەدینی کوبرا)

265. **لەیلا : ئامـاژەیەکە بـۆ خۆشویسـتراوی ڕاسـتەقینە کە ئەویـش خوایە** (عەبدولغەنی نابلسی)

266. **فریشـــتە : نیشـــتەجێی ئاســـمانەکانن دەتـــوانن شـــێوەی جیاوازیـان هەبێـت و چەنـد جەسـتەیەکی نیانـداری بـایین** (فەخرەدینـی ڕازی) ، **ئامـاژەیە بـۆ هێـزی ڕوح** (ئیـبن عەرەبـی) ، **جەسـتەی نیانـداری ڕۆشنبوون** (داودی مودەریس)

267. **مەلەکـــوت – پەنهـــانێتی : پەنهـــانی گەردوونە و دواڕۆژە** (نەجمەدینـی کـوبرا) ، **پێـنج هەسـتەکە درکـی پـێ نـاکەن و بەش بەش نابێـت و جەسـتەیەک یـان دووریەک نیـیە بەڵکـو بنچینەیەکـی داچەقیـوە کە پشـتی بەخـوا بەسـتووە** (نەجمەدینـی ڕازی) ، **پەنهـانی هەمـوو شـتێکە** (عەبدولغەنی نابلسی) ، **شوێنی ئامادەبوونی ڕووحەکانە** (ئەبو شاماتی یەشرطی)

268. **مـردن : بـریتیە لە گەڕانەوە و کوشـتنی حەز و ئارەزووەکـان** (جەعـفەری صـادق) ، **جـۆرێکی تـرە لە پـلە بەرزبـوونەوە و گواسـتنەوە لە**

جیهانێکەوە بۆ جیهانێکی تر (ئەبو حامیدی غەزالی) ، جیابوونەوەی ڕووحە لە جەستە (ئیبن عەرەبی) ، پەردێکە خۆشویستەر بە خۆشویستراو دەگەیەنێت (حەبانی ئیبن ئەسوەد) ، تایبەتمەندیەکی بوونە کە دروستکراوە دژ بە ژیان (شەریفی جورجانی) ، دامرکانەوەی حەز و ئارەزووەکانە (ئیسماعیلی حقی بروسوی) ، گواستنەوەیە لە جیهانی تاریکی بۆ جیهانی ڕووناکی (موحەمەدی نەبهانی)

269. **مردوو** : ئەو کەسەیە کە خۆپەرستە و شوێن حەز و ئارەزووەکانی دەکەوێت (ئیبن عەتای ئادەمی) ، ئەو کەسەیە کە بێئاگایە لە ڕێگای هۆشیاری (ئەبو عەبدولڕەحمانی سلمی) ، ئەو کەسەیە کە بێئاگایە لە خودا ئەگەرچی زیندووش بێت (غەوس عەبدولقادری گەیلانی)

270. **ئاو** : بریتیە لەو ژیانەی کە دڵەکان زیندوو دەکاتەوە و دڵەکان خاوێن دەکاتەوە لە نەزانی ، بریتیە لە زانست (ئیبن عەرەبی)

271. **پارە** : دەردی لوتبەرزەکانە (حەسەنی بەصری)

272. **جەرک :** ئاماژەیە بۆ تاریکی و نەزانی لە دەستەواژەی سۆفیگەریدا (ئیبن عەتای ئادەمی)

273. **لوتبەرزی :** ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بە باشتر بزانێت لە کەسی تر (ئەحمەدی ڕیفاعی) ، باوەڕبوونە بە تایبەتمەندیبوونت و خۆبەکەمزانین پێچەوانەکەیەتی (ئەحمەد زروق)

274. **کتێب :** بریتیە لە زانستی خودایی (موحەمەد بەهائەدینی بەیتار)

275. **کورسی :** پێگەی فەرمانکردن و ڕێگری لێکردنە ، کە لە قورئاندا دەفەرموێت شوێنی دوو پێیە واتا پێی فەرمانکردن و پێی ڕێگری لێکردن (ئیبن عەرەبی)

276. **پەیامهێنەر :** بریتین لە پزیشکی دڵە نەخۆشەکان (ئەبوحامیدی غەزالی) ، ئەوەیە کە فریشتەیەک پەیامی خودایی بۆ دەهێنێت و لەو پەیامەدا پەیڕەوێک هەیە لەلایەن خوداوە کە پەیامهێنەرەکە لەڕێیەوە پەرستش دەکات (ئیبن عەرەبی) ، بریتیە لە ڕووناکی و

ڕۆشنایی کە نە چاوێک دیویەتی و نە گوێیەک بیستویەتی و نەش بە دڵی مرۆڤێکدا هاتووە (ئیبن سەبعین) ، ئەو کەسەیە کە خودا کەموکوڕیەکانی پێی وتووە و شتانێکی لە ڕادەبەدەری لەسەر دەستی ئەنجامداوە بۆ باوەڕهێنانی بونەوەران (ئیبن شەهرەیاری عێراقی)

277. **هۆشیاربوونەوە – هۆشمەندبوون – ئاگاداربوونەوە – بەئاگاهاتنەوە** : دەرچوونی بەندەیە لە بێئاگایی (موحەمەدی مەجزوب) ، لاچوونی بێئاگاییە لە سەر دڵ (عەبدولمونعیم حەنەفی)

278. **پەشیمانبوونەوە** : بریتیە لە ویستی گۆڕانکاری لەبەر هەبوونی تاڵێتی لە تاوانکاریدا (ئیبن زیادی علیمانی)

279. **خراپەکاری – بەدکاری – بەدڕەفتاری – نابەجێیی**: بریتیە لە ئەنجامدانی تاوان ئیتر هەر کارێک بێت (سەهلی تەستری) ، هەرشتێکە کە خەڵک جگە لە یادی خودا کۆببنەوە لە پێناویدا (جونەیدی بەغدادی)

280. **ئـــاگر : بـــريتيه له بێئاگـــايي له خـــودا** (ئەبـــو مەدينـــی مەغريبـــی) ، **نيشـــاندەری گەورەيـــی و دەســـەڵاتداری خـــودايه** (ئەجمەدينـــی كـــوبرا) ، **بنچينەيەكـــی جـــوانه كه درەوشـــاوەتەوە بە شـــتێكی ســـوتێنەری گەرم ، پـــێچەوانەی تـــاريكيه ڕوونـــاكيەكەی** (ئيســـماعيلی بروســـوی) ، **يەكـــێكه له مـــاڵ و پێگەكـــانی دواڕۆژ ، بـــريتيه له ئـــاگری كارەكـــانی مـــرۆڤ جـــا كـــاری ڕووكەش بـــن يـــان پەنهـــان و شـــاراوە ، يـــاخود بـــريتيه له دەرئەنجـــامی كارەكان** (ئيبن عەرەبی)

281. **نـــيەت – مەبەســـت : بـــريتيه له مەبەســـتی كردنـــی شـــتێك بە دڵ** (ئەبـــو ســـلێمانی خەطـــابی) ، **بـــريتيه له دڵـــی دڵەكـــان چـــونكه ئەگەر مەبەســـت لەنـــاو دڵ نەبـــوايه ئەوا بەهـــای دڵ نەدەزانـــرا** (ئەبـــو طـــاليبی مەككـــی) ، **ئەوەيه كه بەدڵـــدا دێـــت و تەنهـــا خـــودا دەيبينێـــت** (ئەحـــمەدی ڕيفـــاعی) ، **مـــاڵی ويستەكانه** (ئيبن عەرەبی)

282. **خامۆشــی – بێــدەنگی :** بــریتیە لە جێگیربــوونی خــود کاتێــک چێژ دەبینێت لە شتە جوانەکان (ئەبو حامیدی غەزالی)

283. **دڵتەنگــی :** بــریتیە لە ســزای تاوانەکــان (ئیــبن مــوحەمەدی راســبی) ، شوێنی تێڕوانینە لە دڵدا (عەبدولکەریمی جیلی)

284. **هــو – ئەو :** بــریتیە لە نــاوی خــودا (عەلــی کــوڕی ئەبوتاڵیــب) ، نــاوێکە لە ناوەکــانی قورئــان (قەتــادەی سدوســی) ، نــاوی هەرە مەزنــی خــودایە کە هەرچــیەک پێــی داوا بکرێــت داواکە گیــرا و قبــوڵ دەبێــت (ئیــبن عەبــدولڕەحمانی ســدی) ، ئامــاژەیە بــۆ خــودی خــودا (نەجمەدینــی کــوبرا) ، بــریتیە لە پەنهــانی خــودی خــودا کە کەس نایبینێــت و مەبەســتیش پێــی خــودایە هەرکــات بە زمــان بوترێــت (ئیــبن عەرەبــی) ، ئامــاژەیە کە ســەرەتا و کۆتــا هەر خودا هەبووە و دەمێنێت (جەمالەدینی خەلوەتی)

285. **حەز و ئـــارەزوو :** ســـەرچاوەی تاوانەكـــانە (حەســـەنی بەصـــری) ، كەوتنـــی خۆشەويســـتيە لە دڵـــدا لە ســـەرەتای دروســـتبوونيەوە لە دڵ (ئيبن عەرەبی)

286. **يەكخواپەرســتی – يەكتاپەرســتی – بــاوەڕداری – تاكپەرســتی:**

ئەوەيە كە خەيـــاڵی خـــودا نەكەيـــت و ســـنورداری نەكەيـــت بە خەيـــاڵ (عەلـی كـوڕی ئەبـو تاڵيـب) ، ئەوەيە كە بزانيـــت توانـــای خـــودا لەنـــاو شـــتەكان دەردەكەوێـــت ، هەرچۆنێـــك بيـــر لەخـــودا بكەيـــتەوە ئەو بەوشـــێوەيە نيـــيە (ذوالنـــونی ميســـرِی) ، بـــريتيە لە نەشـــوبهاندن و وێنـــاييەكردنی خـــودا بە بـــونەوەران (ئيـــبن ئيســـماعيلی رســـی) ، بـــريتيە لە دڵنيـــايی (بايەزيـــدی بەســـتامی) ، بـــريتيە لەوەی بزانيـــت كە ناتوانيـــت درک بە خـــوا بكەيـــت (ئەبـــو حوســـەينی نـــوری) ، بـــــريتيە لە نهێنـــــی خـــــودا و ڕۆشـــــناييەكە كە دەتســـــرِێتەوە لە بەرامـــبەر ئەودا (ئەبـوبەكری شـيبلی) ، واتــا پشـــت و پەنــا تەنهــا خـــودايە (غەوس عەبـــدولقادری گەيلانـــی) ، ويژدانێكـــی بەگەورەدانـــانە لە دڵـــدا كە ڕێگـــری

دەکـــات لەوەی خـــودا بە شـــتێک بشـــوبهێنرێت (ئەحـــمەدی ڕیفـــاعی) ،

باوەڕبوونە بە تاک و تەنهایی خودا (کەمالەدینی قاشانی)

287. **چرپەچـرپ :** هەمـوو شـتێکە جـگە لە خـودا (سـەهلی تەسـتری) ،

وتەیەکە کە بە ناخـــدا دێـــت لە شـــەیتانەوە و نیشانەکەشـــی ئەوەیە کە

ئەگەر بـانگی کەسـێک بکـات بـۆ خراپەکـاری و ئەنجـامی نەدات ئەوا

بـانگی دەکـات بـۆ دانەیەکـی تـر (غەوس عەبـدولقادری گەیلانـی) ، کـۆمەڵە

دوکەڵـێکە کە لە ئـاگری خـودی فەرمـانپێکەر بە خراپەکـاری دروسـت

دەبێــت (عـومەری سـوهرەوەردی) ، ئەوەیە کە بەدڵـدا دێـت لەلایەن شـەیتانەوە

(ئیــبن حەســەنی ســمنودی) ، ئەوەیە کە دەدرێـــت بەســـەر دڵـــدا لەلایەن

شەیتانەوە (سولەیمانی خەڵوەتی)

288. **خـۆبەکەمزانین :** بـریتیە لەو بەخشـینە شـتانێک بە خەڵـک کە

حەز بـکەی بە خـۆت ببەخشـرێت (عەلـی کـوڕی ئەبوتاڵیـب) ، بنچیـنەی هەمـوو

سـەربەرزی و پـایەبەرزیەکە (جەعـفەری صـادق) ، سـوارچاکی دڵەکـانە (موسـای

کـازم) ، ڕازیــنەری کەســایەتیەکانە (مــوحەمەدی جەواد) ، زەلیلبــوونی دڵەکــانە

بەرامــبەر خــودا (ڕوەیمــی بەغــدادی) ، نهێنــیەکە لە نهێنیەکــانی خــودا کە

لەلای خــۆی گەنجیــنەی کــردووە و تەنهــا دەیــدات بە پەیــامهێنەرێکی

پێگەیشــتوو یــاخود کەســێکی ڕاســتگۆ ، کۆتــا پــێگەیە کە پیــاوانی خــودا

دەگەن پێـــــی (ئیـــبن عەرەبـــی) ، خۆســــپاردنە بە خـــــودا (نەجمەدینـــی ڕازی) ،

گــوێنەدانە بە ســتایش و لــۆمەکردن (عەلـی کیزوانـی) ، بــریتیە لە شــکانی دڵ

لەپێناو خودا کە کەسەکە پێی وابێ لەوانی تر باشتر نییە (مارفی نۆدێ)

289. کـــات : بـــریتیە لەوەی لەنێـــوان ڕابـــردوو و داهـــاتوودا هەیە

(قوشەیری) ، ئەوەیە کە زاڵە بەسەر بەندەکاندا (عومەری سوهرەوەردی)

290. لەخواترســان : بــریتیە لەوەی پێــت وانەبێــت لەکەس باشــتریت

(عەبــدوڵلای کــوڕی عــومەر) ، گەورەی ڕەوشــــتبەرزێتیە (عەلــی کــوڕی ئەبــو تاڵیــب) ،

وازهێنــانە لەوەی خــودا ڕێگــری لــێ کــردووە و ئەنجامــدانی ئەوەیە

کە خــودا داوای کــردووە (عــومەری کــوڕی عەبــدولعەزیز) ، ئەوەیە کە لە دڵتــدا

جگە لە خودا هیچ نەبینیت (جەعفەری سادق) ، خۆبەدورگرتنە لە هەموو شتێک کە گومانی لەسەربێت (بایەزیدی بەستامی) ، ڕەوشت جوانیە (جونەیدی بەغدادی) ، پۆشاکی دڵە (ئەبوبەکری واستی) ، کلیلی ڕێنوێنی کردن و دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستە (ئەبو حامیدی غەزالی) ، ئەوەیە کە خودا نەتبینێت لەکاتی ئەنجامدانی شتێک کە ڕێگری لێت کردووە (غەوس عەبدولقادری گەیلانی) ، هەموو کردەوەیەکە کە لە دۆزەخ بتپارێزێت (ئیبن عەرەبی) ، ئەوپەڕی پایەی ڕێبوارانی ڕێگای خودایە (ئیسماعیل بروسوی)

291. **لەخواترس :** ئەو کەسەیە کە زاڵ دەبێت بەسەر حەز و ئارەزووەکانیدا (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ، ئەو کەسەیە کە هەرکەسێک ببینێت دەڵێت ئەمە لە من باشترە (حەسەنی بەصری) ، ئەو کەسەیە کە لە جیهان دابڕاوە و خۆی تەرخانکردووە بۆ خودا (جەعفەری صادق)

292. **دڵنیایی :** ڕوناکیەکی خودایە کە دەیخاتە دڵی بەندەکانەوە (ئەحمەدی ئەنتاکی) ، لاچوونی پەردەیە لەسەر دڵەکان (یەحیای

ڕازی) ، بــریتیه له خــودا ، بــریتیه له ئــارامگرتن ، بــریتیه له ئەنجامــدانی

هەمــوو گــوێڕایەڵیەک (ســەهلی تەســتری) ، جێگیربــوونی زانیــنە له دڵــدا ،

لاچــوونی گومــانە بە بینــین و دڵنیــابوونەوە (جونەیــدی بەغــدادی) ، ســەلامەتی

دڵە له نەخۆشــی نەزانــی و گومــان (قــوتبەدینی دیمەشــقی) ، ئــارامبوونەوەی

دڵە بە خودا لەڕێی زانستێکەوە کە نەگۆڕێت و لانەچێت (ئیبن عەجیبە)

# پێڕست

